ڕۆمان

# ڕەحمەتلوقم

زایەر عەبدوڵڵا





نووسەر: زاهیر عەبدوڵلا
بەرگ و ناوەڕۆک: ئیبراهیم ساڵح
بلاوکار: ناوەندی ئاشتی
نرخ : ٤٠٠٠
بابەت: ڕۆمان
نوبەی چاپ: یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠٢٢

ژمارەی سپاردن ٣٥٤ ی ساڵی ٢٠٢٢
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

* پێداچوونەوەی زمانەوانی عەبدولرەحمان فەرهادی....
سوپاسی ماندووبوونی دەکەم.
* بەر لە خوێندنەوە ..... زۆربەی کەسایەتییەکانی ناو ئەم ڕۆمانە
دروستکراوی خەیاڵی خۆمن .... بە تایبەتی پاڵەوانە
سەرەکییەکان... هەر بۆ ئاگاداری.
* سوپاس بۆ عبد الغفار عبدالله
زایەر

# ١

## هەولێر ناوەڕاستی حوزەیرانی/ ١٩٦٣

هەر بە فیتی حکوومەت لەناو شار و بەتایبەتی لەگەڕەکی تەیراوە وا قاو درا.. ئەو ژنانەی مێردەکانیان بوونە پێشمەرگە و هەولێریان بەجێهێشتووە دەگیرێن و سرگومیان دەکەن.

ئەم قاودانە چەند مانگێک پاش ڕۆیشتنی پۆلێک پولیسی بنکەی خانەقا بۆ ناو شۆڕش بوو، ئەوێ ڕۆژێ مفەوەزی سێ ئەستێرەی بەرپرسی بنکەکە (برایمەفەندی ئۆمەریلی) و ژمارێک پۆلیسی کورد دەستێکیان بە جبەخانەی بنکەکەیاندا هێنا، بە موسەلەحەکەیان هەرچی چەک و فیشەک و تەقەمەنی هەبوو لەتەک (سەلیم حەمەد گەردی) شوفێر، ڕەوانەی دەرەوەی شاریان کرد و بەخۆشیان گورج وگۆڵ بنکەیان جێهێلا و بەرەو بێستانە ملی ڕێی هات و نەهاتیان گرتەبەر، لە شار دەرچوون و بەسەلامەتی گەیشتنە جێی مەبەست.. بەر لە خۆشیان ڕفاندنی موسەلەحەکە و دەربازکردنی ئەم هەموو تفەنگ و دەمانچە و تەقەمەنییە داغێک بوو نرا بە جەرگی دوژمنی داگیرکەر.

لە هەولێریش دەنگۆی بەتاڵکردنی بنکەی پۆلیسی خانەقا و چوونە دەرەوەی برایمە فەندی و پۆلیسە هەڤاڵەکانی وەک ئاگری ناو پووش بڵاوبووەوە، هەبوو هەناسەی خۆشی هەڵدەکێشا و دەستخۆشی لێدەکردن و بە قوربانیان دەبوو، هەشبوو دەیگوت غەدرییانکرد ئاخر شار بەبێ پۆلیس و چەک چۆن بەڕێوە دەچێت.

عەیامێک بەسەرچوونە دەرەوەی ئەم پۆلە پێشمەرگە پۆلیسە ڕابردبوو، لە هەولێر گرتنی ژن و منداڵی پێشمەرگە بە ڕاست گەڕا، پۆلیسی کورد (ئەوانەی لەشار مابوونەوە) هاوشانی پۆلیسە عارەبە هاوردەکان بەشار وەربوون و کەوتنە ڕاوەگرتنی ژنە پێشمەرگە.
(بەگم)ی زگ لەسەر زاری، لەماڵی خاڵی خۆی حەشاردابوو بەو هیوایەی ئاشکرا نەبێت و پێینەزانن و نەگیرێ.. ئاخر ئەو ژنی یەکێک لەو پۆلیسە پێشمەرگانە بوو کە لەگەڵ برایمە فەندی ملی شاخیان گرت.. کەچی بەرە بەیانێکی زوو تەق تەق لە دەرگا دراو چەند جارێکیش بە توندی تەقە تەقەکە دووبارەکرایەوە، هەرکە (پەرێ)ی ژیکەڵە لەخەو ڕابوو بەغاردان چوو دەری حەوشەی کردەوە پۆلیس بەناو ماڵێدا وەربوون..
ئەوانیدیش بە پرتاو لەناو جێو بالینگان ڕابوون و واق وڕماو سەیری ئەم هەموو پۆلیسە چەکدارەیان دەکرد، هەینێ ڕەئیس عوڕەفایێک دەنگیدان:
-بەگمی کیژی عوسمان ئەشکەفت سەقایی بێتەوە پێش.
بەگمی زڕجوو، بەگمی ترسنۆک بە لەرزە لەرزوو هەناسە بڕکێ چووە بەردەمی ڕەئیس عورەفایە کوردەکە.
-فە...فە... فەرموو مامە ئەمن بەگم.
+ئەتو بەگمی.. پەکو خۆ زگیشت لەسەر دەویە و ئاوسی؟! یەڵڵا پێشمانکەوە.
بەگم بە ترس و لەرزەوە:
-مامەی پۆلیس زۆر زۆرم میزدێ، لێدەگەڕێی میزەکی بکەم؟
ڕەئیس بە واق وڕماویەوە:
-بیکە دایکەکەم میزەکەت بکە.

هەینێ بەگم هەر لەبەر چاوی ڕەئیس و پۆلیسـەکانیدی لەسـەر ئەو جۆگەلەیەی لە حەوشـەیڕا درێژ دەبۆوە بۆ بن دەرگای کۆڵانێ دەرپێی هێنا خوارێ و کووش میزێکی بە ئیسراحەتی کرد، کە تەواو بوو دەرپێی هەڵکێشاوە و کراسەکەی بەسەردا داوەو لە ڕەئیسی پرسی:

-مامە کێوەم دەبەن؟

+دەتبەینە فندق سەفینی.. ئەتو میوانی مەی.

پیلی بەگمی زگ لەسـەر زاریـیان گرت و بەهەزار حاڵی بەسـەر موسەلەحەیان خست و پۆلیس لەم لاو لەولای دانیشتن.. ڕەئیسیش گوتیە شوفێرەکەیان:

_زووکە باژۆ سـێتاقان لۆ ماری مەولوودی پۆلیس، هەتا مەعسـومەی ژنی لەبەر دەستمان هەر نەهاتیە.

ڕەئیش لەپێشـەوە سـواربوو.. موسـەلەحە بەرەو گەڕەکی سـێتاقان تیژ تیژ دەرپەڕی.



ئەو سبەینەیە هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو، هەژدە ژنی هەژدە پێشمەرگەیان گرت و بە موسەلەحە هەموویان بردنە بەندینخانەی سەرایێ.. دیمەنی خەمناکی ئەو هەژدە ژنە پێشمەرگەیە لەناو موسەلەحەی پۆلیسی هەولێرێ، کەم چاو دیتی و کەم کەس شەرەفی ئەوەی پێبڕا ئاخێکیان لەناخەوە بۆ هەڵکێشێ..جگە لەو شەش حەوت کرێکارە لەئیش بەجێماوەی مەیدانی کرێکاران و مەلای مزگەوتی قیبلە خواری ڕۆخ بەندینخانەی سەرایێ نەبێت، مەلاش بە (لاحەولە ولاقەووەتە) ڕووی لە ژنە گیراوەکان وەرگێڕا بۆ نوێژی بە جەماعەتی بەیانی خۆی لە مزگەوتێ پەستا.
لەوێ، لەبەر دەرگای گەورەی بەندینخانەی سەرایێ، یەک یەک ناوی خۆیان و هاوسەرەکانیان نووسرا، ناونیشانی ماڵی باوک یان خەزوران تۆمارکرا.. هەینی بە شرق و هۆڕ دەرگاێکی بچووکی ناو دەرگا گەورەکە کرایەوە و هەموویان ئاودیوی کونە ڕەشێ کردن.
هەر لەگەڵ دانیشتن، بەگم فینگە فینگی دەست پێکرد و بە نوزانەوە گوتی:
-خوایە بە قوربانتبم ئەمن بەخۆم قەیدیناکە..ئەدی چ لەو زگەی بکەم..کو دەرەقەتی خەمی خۆم و خەفەتی ئەو کۆرپەیەی ناو زگم دێم.. خوایە گیان ئەتوو لەسەر سەرانی و ئاگات لە حارو ئەحوارمان هەیە بەگەورەیی خۆت بەهانامان وەرە.
ئیدی یەک یەک و دوو دوو ژنە پێشمەرگە لەیەک خڕبوونەوە و کەوتنە قسان.
ژنی عەریف ئەحمەدی گوتی:
-وەڵڵاهی منەتیان بە بنی نەعلەکەم، چییان نەکردییە با بیکەن.. خۆ ئەمن سەرم برندەو زمانم درێژە و دەرێم ژنە پێشمەرگەم.

ژنی عومەری حەمەلاو پاسکلچی هەڵیدایێ:
-ئاخر خوشکم ئەمن کۆشەک منداری سەرکەو بنکەم بەجێهێشتییە.. خەسوو خەزوورم هۆردووک لەناو جێی کەتینە.. ئاخر ئەو مندارانە کو دەژین.. ئەمن قورِی کێندەرێ بەسەرەخۆمدا بکەم.. با پێتان برێم بە غەوس هەنکی یەک نوکە دەرزی خەمی خۆم نییە.
عەیشێ.. لەهەمووان دونیا دیدەترو چاوکراوەتر بوو دەنگی هەڵبرِی بێدەنگی کردن:
-ئەها ژنینە با هەمووتان گێتان لێبێت، ئەمە تازە گیراینە، چ فینگە فینگ و سەردولکان دامەمەزرێنن، ئەوە حکوومەتە کەروێشکی بەعارەبانەی دەگری، دوژمنە و هەقی خۆیتی چ خراپە لەگەرەمەی بکات، وا حەپسی کردینە بەران مێردەکانمان لە شاخینە و ئازادن، خۆ دەستیان لە قونێدا نەمایە با بێنە شاری و ئەمە لە حەپس و سندمی ئەو زاڵمانە قورتارکەن.
***
لە یەکەم شەوی ئەم هەژدە ژنە پێشمەرگەیە لە حەپسخانەی سەرایێ سەرمەقولاتی زۆر ڕوویدا، هەندێکیان خەریکی گێڕانەوەی خۆشی سەرجێی مێردەکانیان بوون بەر لەوەی بچنە چیا، هەندێکیشیان تێک قژقژابوون بە داو و کشتەک ڕووخسار و چاو و برۆی یەکتریان هەڵدەپاچی و بە حریت و هۆر پێدەکەنن و هەروەک نە بایان دیتبی نە باران.
بەڵام عەیشێی سەرمژن زوو بە زوو هەستی بە باری ناهەمواری بەگم کرد و زانی لە چ ئازارێکی جەستەیی و دەروونیدایە، بۆیە دەرفەتێکی قۆزتەوە و

خۆی گەیاندە بەگمی زگ لەسەر زاران، هەرکە لە ڕۆخی دانیشت یەکسەر لێی پرسی:

-خوشکۆرە ئەتوو ناوت چییە؟

+بەگم.. ناوم بەگمە ژنی عەریف عەتەوڵلای تەیراوەییم.

عەیشێ دڵی بەم قسەی خۆش بوو هەڵیدایێ:

-نێ ئاخر کاکە عەتەوڵلاش هەر لەگەر پیاوەکەی من و برایمە فەندی چوونە دەرێ و بوونە پێشمەرگە..

هەش وەســەر، دیارە کاکم عەتەوڵلا پێش ئەوەی بڕوا زوو بە زوو دەستی خۆی وەشاندییە و کەتنەکی گەورەی لەگەر کردی.

+ئەرێ وەڵلا خوشــکم کەتن ئەوها کەتن، ئەمن چوزانم ئاوســم دەکات و دوایێش بەجێم دێڵی و ملی چیای دەگری، ( هەردووکیان پێکەنین) عەیشێ یەکسەر گوتی:

_ئەهـ لەبابی منی کەوی.. وەڵلا کەتنی وەها هەر لە پیاوان دەوەشــێتەوە.. رەبی قەلبی ساغ بی.

عەیشــێ دەیزانی بەگم باری نالەبارە و زگ و زاری باش نییە، بۆیە چاوی لێ غافڵ نەدەکرد و زۆر باش چاودێریی دەکرد و وەک کیژی خۆی دەیعاملاند.. تا لەپڕ شەوێکیان بەرەژانی بەگم بووە ڕاستی و ئێش و ئازارو ژان دەنگیان بە بەگم بەرزکردەوە، هەینێ عەیشــێ و ژنەکان هاواریان بۆ پۆلیســی ئێشــکگر برد و تێیانگەیاند ژنێک ژان گرتوویەتی وکۆرپە پێشمەرگەیەک بەرێوەیە، بەمجۆرە بەگم گەیاندرایە خەستەخانەی جمهووری و یەکســەر بۆ بەشــی منداڵبوون، بەرەبەیانێکی خەماوی واقە واقی کۆرپەیەک و گریان و ڕۆندکی بەگم تێکەڵاوبوون.. کۆرپەلەیێکی کوڕ بە غەریبی و دوور لەچاوی خزم و کەس هاتە دونیایێ.

***

بەرەبەری کاتژمێر دەی بەیانی، کۆرپەیێکی بە قومات پێچراویان هێناوە لای بەگمی دەست بە کەلەپچەی لە قەرەوێڵە بەستراو، هەندەی پێنەچوو دکتۆر ئومییە و پەرستارێک هاتن تا دایک و کۆرپەلەکە بپشکنن و لە تەندرووســـتیـان دڵنیـابن، لەم کـاتەدا دەنگی گۆرانییێکی غەمگین لە ڕادیۆی ژووری پەرســـتارەکانەوە دەهاتە بەرگوێ، ئەوە دەنگی ناوازەی فوئاد ئەحمەد بوو گۆرانیی (غەریب غەریب)ی دەخوێند، بە بیســـتنی کۆپلەی (غەریـب غەریـب بێکەس و کـارم... غەریـب غەمگین تەنیـا هەژارم) فرمێسک لە هەردوو چاوی بەگمی زەیستان جۆگەلەی بەست، لەم کاتەدا سیستەرەکە لێی پرسی:
-دادە نـاوەکی لە کورەکەت بنێ، هەتـا ئەوراقتـان تەواوکەین و بەیـان ویلادەی لۆ دەرکەین.
بەگمیش لەگەڵ ئەم دەنگە بەســـۆزەی فوئـاد ئەحمەد ئاوێتە بوو بوو، فرمێسکی لە چاوان هەڵدەڕشت، بە هەنسکەوە گوتی:
-لەبەر خاتری ئەم گۆرانییەیی کاک فوئادی مام ئەحمەد تەبیبی خزمی بابم ناوی لێدەنێم غەریب، ئەدی ئەوە نییە دەرێ غەریب غەریب بێکەس و کارم؟!
ئیدی کۆرپەکە ناونرا (غەریب)، لەپەڕاوی خەســـتەخانەی جمهووری بەشـی لەدایکبوون بۆ پۆلیسـی سـەرا و بەندینخانەکەی نووسـرا (غەریب عەتاوڵلا کەریم).. دوو ڕۆژ پاشـــتر بەگم و غەریبی کوڕی و پەڕاوی نەخۆشـــخانە بە موســـەلەحەیەکی ڕەنگ تەڵخ گەیەندرانەوە بەندیخانەی سەرایێ.

***

مانگێک و چەند ڕۆژێک بەســـەر تەمەنی (غەریب) ی بچووکترین زیندانی ســیاســی ڕەت بوو، بەگم هەســتی دەکرد کوڕەکەی بەشــیری مەمکەکانی تێر نابێت و جگە لە گریان ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازتر دەبێت.. زۆر خەمی لێدەخواردو نەیدەزانی چی بکات، تا ڕۆژێکیان دەردە دڵی خۆی لەلای عەیشێ کرد، عەیشێش لێزانانە لە مەسەلەکەی ڕووانی و کەوتە ئامۆژگاری دایکی غەریبی:

_خوشــکم بەگم، ئەتو بەتەنێ هی خۆت نی، ئەتو ژیان و مان و نەمانی غەریبۆکەشــت لەســەر شــانە، ئەتو دەبی لەجیاتی خەم و خەفەت نانەکی باش بخۆی.. زۆر بخۆی لۆ ئەوەی شــیری مەمکەکانت زۆر بیت و ئەو کوڕەی تێر بکات.

بەگم بەدەم گریان و بەچاوی فرمێسکەوە گوتی:

+ئاخر پێم ناخورێ، بەدەســـــت خۆم نییە درم هیچ نابا.. مەعیدەم لە خواردنێ زیز بووە بە پارەکو دووان تێر دەبم و دەست دەکێشمەوە.

عەیشێش یەکسەر وەک فەرمان سەپاندی:

_ نابی دەست بکێشییەوە... بەزۆریش بی دەبی بابی دوو نەفەران شیوی بخۆی.. خۆت دیتیە دەرێی تاژی ماری ســـەیدە لارەی ئەوەندە زەعیف و ڕەق و تەق بووی ... وەڵڵاهی لەمەودوا لەکاتی نانخواردنێ بەخۆم لە تەنیشــتت دادەنیشــم، ئەگەر ئازای زوو دەســت هەردەگری و چ ناخۆی، شەرت بی لەشەرتی خوای هەموو تیتک و پرچت دەردەینم.

بەڵێن و سۆز لەنێوان عەیشێ و بەگم درا کە ئیدی شین و گریان بەسەو دەبێت بە تەواوی ئاگاداری غەریبی کوڕی بیت و پشتگوێی نەخات.. لە هەینێوە بەگم و غەریب ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەڵیاندا و بوژانەوە و تەندروست

بوون، عەیشـــێش بەردەوام ئاگای لێیان بوو بۆیان ببووە دایکێکی یەکجار میهرەبان.

کەچی ئەم بووژانەوە و ژیانە تازەیە لە دوومانگ پتر درێژەی نەکێشـــا، لەپڕ هەواڵی شـەهیدبوونی عەتەوڵڵای هاوسـەری بەگم و باوکی غەریب لە هەولێر دەنگی دایەوە.. هەواڵەکەش وا گەیشت.. لەم ڕۆژانە بەیانییێک سوپای عێراق بە نیازی هێرشکردنە سەر چیای سەفین، سەرەتا تۆپبارانی بارەگا و سەنگەرەکانی پێشمەرگە دەکەن.. پێشمەرگەش دەست بەچەک و ئامادە لەسـەنگەر دەچەقن و سـینگ دەدەنە بەر تۆپ و گوللە هاوەنی دوژمن.. ئیدی بەر لەهێرشـی زەمینی گوللە تۆپێک بەناو ئەو سـەنگەرە دەکەوێت کە عەتەوڵڵا و چەند ڕەفیقێکیدی تیادا دامەزراون پارچەیەک بەر عەتەوڵڵا دەکەوێت و دەمودەســـت شــــەهید دەبێت.. گەرماوگەرم هاوسەنگەر و پێشمەرگەکان هەر لەوێ دەست و بردی لێ دەکەن و چەند مەترێک لە دووری ســـەنگەرەکەیان گۆڕی بۆ هەڵدەکەنن و هەر بە جلکی خوێناوی تەسلیم بە خاکی سـەفینە شیێتی خۆشـناوانی دەکەن و دەگەڕێنەوە ناو ســـەنگەرەکانیان و دادەمەزرێنەوە بۆ بەرگری لە هێرشــە چاوەڕوانکراوەکە.

بەمجۆرە هەواڵەکە گەیشـــتە دەســـەڵاتدارانی شـــارو هیچ بیانوویێک بۆ مانەوەی بەگم وغەریب لە حەپســـخانەی ســـەراییدا نەما.. بانگی خاڵی بەگمیان کرد و کردیانە کەفیل.. هەینێ بە مات و مەلوولی بەگم و خاڵی و غەریبۆکە گەڕانەوە ماڵێ تا بە نهێنی پرســـە دابنێن و هەر بە نهێنیش بەگم قوڕ بپێوێ.

## ٢

هەر بۆ شـــەوەکەی، پاش ئەوەی بەگم چڵک و دژونی بەندینخانەی لەخۆیی و لە غەریبۆکەی ڕامالّی و گەرماوێکی باشـــیان کرد، خالّی بانگی کردو کەوتنە گفتوگۆ لەســـەر چارەنووس و دوارۆژی خۆیی و کوڕەکەی.. خـالّ زۆری درێژە دایێ و خـالۆژنیش بۆی مۆر دەکرد، دونیایێک دەبێت و نابێتیان دەرهەق بە هەڵســوکەوتی بێوەژنێک لەبەردەم بەگم هەڵڕشت، خالّ سووکە ئاماژەیێکیشی پێیدا:

_ با قەدەر عەیامێک بەســەر بچێت بە نیازن بیدەنە مەغدیدی بنعامی، چونکە ئەویش تازە ژنی مردووە و کیژۆڵەکی لەپاش بەجێماوە.

بەگم سەرەتا لەفرمێسک ڕشتن بترازێ هیچی نەگوت، هەرکە مەسەلە هاتە سەر شووکردن، بە لەچکە ڕەشەکەی فرمێسکی چاوەکانی سڕیەوە و ددانەکانی جیڕ کردەوە و بەچاوێکی زەقی پڕ لە ئاگر ڕووی لە خالّ و خالۆژن کرد و قیژاندی:

_کەس حەدی نییە جێی عەتەوڵلایەکەی من بگرتەوە، ئەو لۆکەی لەگوێیان دەرینن، ئەمن مێردی ناکەمەوە ... قەت درم نایێ غەریبۆکەی باوێمە بەردەستی زڕبابەکی هەتا ئەگەر باشیش بیت، ئەمن لەمەودوا لۆ غەریبۆکەکەی خۆم دەژیم و دەبمە داک و بابی، هەتا ئەو وەختەی خوا ئەمانەتەکەم لێوەردەگرتەوە.

خالّی بە هەڵچوونەوە گوتی:

_ ئاخر ئەوە شـەرعە.. هەقی خۆتە لەژێر ســابات و ســەیوانی پیاوەکیدا بیت.. دەباشە پێم نارێی کو دەژی، کو مەعیشەتتان مەیسەر دەکەی؟

بەگم غەریبۆکەی لەباوەش گرت و هەستا سەرپێ و ژنانە گوتی:
ـ ئیشێ دەکەم.. نە سەقەتم نە کۆرەمە.. دەست و چاوم هەیە ئیشەکی دەبینمەوە...هۆدە خـانییەکی بەکرێ دەگرم.. دەبی غەریبی کورم بەسەربەرزی گەورەکەم.
خالۆژن هەریدایێ:
ـ چ ئیشـەکی دەکەی... ئەوە زەلام بەهەزار دەردەسـەری هەتا ئیشـەکی دەســـت دەکەوی و لوقمە نانەکی لۆ مار و منداری دەپچڕیتەوە.. ئەتو جوان و جاحێر چت پێدەکرێ؟ چ ئیشەکی دەکەی؟
بەگم توندتر باگۆی دایەوە:
ـ دەچمە ماران خزمەتیان دەکەم... نانیان لۆ دەکەم – کۆرێ دەکەم.. خورامەتیان دەکەم بەس ناهێڵم غەریبی کورم موحتاج بیت.
خالی دەهری بوو. هەستا بەتوڕەیی چووە دەرێ و لەناو دەرگا گوتی:
ـ هەر هەویلێ... ئەتوش لەداکە شێتوشوورەکەت باشتر نابی (ژوورەکەی بەجێهێشت).
خالۆژن پاش تاوێک بێدەنگی خۆی وا پێشاندا هێور بۆتەوە ... دەستێکی بەسەر سەری بەگمدا هێنا و گوتی:
ـ کیژم، ئاقرت هەبی... دونیایەکە خراپ بووە ... ئەگەر کچ قسەکی لە دووبی، ئەوە بێوەژن دوو قسـەی لەدووە، بە قسـەمان بکە.. با بەخۆو بە کوڕەکەت سەرگەردان نەبن.
بەگم کۆتایی بە قسان هینا و ڕووی لە خالۆژنی کرد:
ـ خارۆژن.. ئەمن گێنادەمە قسەی خەرکی – ئەمن بەسەربەرزی لۆخۆم و لۆ کورم دەژیم... ئەنگۆش هەر ئەوەنـدەم سـەبر لێبگرن هەتـا کونە

کۆریتەکی دەبینمەوە و دەچمە ناوی.. هەینیێ دەبێ بیسەلمێنم کە ژنیش ئەگەر بیەوێ دەتانی ئیشێ بکات و بەسەربەرزیش بژی.

***

چەند جاری دیکەش ئەو دەمەتەقێ و چەلەحانێیە لەنێوان بەگم و خاڵ و خاڵۆژنی هاتنەوە گۆڕێ، دواجار بەگم بەیانییێکی زوو غەریبی لەباوەشێ گرت و لەماڵی خاڵی دەرپەڕی... سەرەتا چووە لای مام حوسێن و دادە فەوزیەی، ئەوان تازە نۆک و لۆبیای مام سەیدییان لە قاپان کردبوو چاوەڕێی نەبیلی کوڕییان دەکرد نانی گەرم بینتەوە و دەست پێبکەن. هەرکە بەگم لەلایان دانیشت هێشتا غەریب هەر لە باوەشیدا بوو.. مام حوسین گوتی:

ــ ڕەبی بەخێر بێی.. بەگم خێرە بەو سبەینەی هەرتکوتاینە سەری؟

بەگم هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

ــ مام حوسین لە ئیشەکی دەگەڕێم ئەمن و ئەو هەتیمەی لە موحتاجی قوتار کات.. تەشەبوسی بەتوو بکەم نەک بە خەرکی دی ... ئەوجا ئەتووش خۆت و کەرەمی خۆت.

مام حوسێن، سەیرێکی فەوزیەی ژنی کرد کەخەریکی چایە تێکردنێ بوو... ئەوجا ڕووی لە بەگمێ کردەوە و گوتی:

ــ خوشکە بەگم.. ئەتوو بەخۆت دەزانی ئەمە هەر ئەو حەمامەی شک دەبەین، ئەتوو چ دەزانی لە ئیشی حەمامێ.

دادە فەوزیە هەڵیدایێ:

ــ فێردەبی... خۆ تەیارە نییە... بە دوو ڕۆژان فێرە هەموو شتەک دەبێ.

بەگمیش گەرماو گەرم لەدەمی دادە فەوزیەیی وەرگرتەوە:
_ قســـەی دادە فەوزیەیە، بەوخوایەی خێرەکی ئەوەندە گەورەم لەگەر دەکەی ... ئینشاڵڵا دەبتە سندوقی سەری خۆت و مار و مندارت.
ئیدی نانی گەرم گەیشتە سەر سفرە و خوانی پڕ بەرەکەتی مام حوسێنی حەمامچی، بەگم هەم نانی ئەو ســبەینەیەی لەگەڵ خواردن، هەم وەهاش ڕێککەوتن لەمەودوا شانبەشانی دادە فەوزیەی بچیتە حەمامێ و ئیش و کارو بەردەستی موشتەرییەکان بکات.
لەوێ هەستا چووەماڵی حاجی لەتیفی سەرکار، لەوێش داوای ژوورێکی بەکرێی لە حەســـــاری محەمەد موختــاری کرد کە حــاجی لەتیف سەرپەرشــتی دەکرد... لە بنەبانێی حەسـارێ ژوورێکی بەکرێ گرت...
هەینێ هەناسەیێکی پڕ بە سییەکانی هەڵکێشا و گوتی:
- ئۆخەی هەردوو مرازم حاســڵ بوو، خوایە هاوارە شــەرمەزاری ناحەز و نامەردانم نەکەی، لەگەڵ هەستانێ بەگم گوتی:
- مەجلیستاندایم..
دادە فەوزییەش یەکسەر لێیوەرگرتەوە:
-ئیمانت قایم.

***

ڕۆژی دواتر بەگم غەریبی لەلای خاڵۆژنی بەجێهێشـــتوو چووە ئەو ژوورەی کە لەگەڵ شـەهید عەتاوڵڵای مێردی مانگی هەنگوینی و ئەو ماوەیەیان تیا بەسـەربرد تا عەتەوڵڵا بە چیای کەوت و ئەویش لە ترسـی گرتن دەرگای داخست و چووە ماڵێ خاڵی و خۆی لەبەرچاوان بزرکرد — هەر دەرگای کردەوە و هەنســـک و یادگاری و ڕووخســــاری مێردە شــــەهیدەکەی هورژمیان بۆ هێنا، ســـەرەتا دانیشـــت و تێرتێر گریاو کفتوکۆی دڵی دامرکاندەوە.. ئینجا هەڵســاو بڕوبوزگوڕ و جلکی خۆیی و هەندێـک قـاپ و قـاچاغی خڕکردەوە، لەگەڵ دوو دۆشــەک و باتانییەکە و دوو بالیف و ســـەرچەفەکەی لەســـەر یەک دانان، دواجار باوڵێکی گچکۆکەی هەڵگرت و دەستێکی لە قفڵەکەی دا تا دڵنیا بێت نەکراوەتەوە — هەینێ بە وەســـتایی لە مـابەینی قەدەی بەتـانییەکە شـاردییەوە و ســەرچەفەکەشـی بەسـەردادا، ئینجا چوو عەرەبانچییەکی لەسەر جادەی تەیراوەی دیتەوە و هینای بزگۆڕەکانی پێ بارکرد.. بردییە حەســارێ و لە ژوورەکەیان داناو ســندوقەکەی لەبن هەموو شـمەکەکان بزرکرد، دەمودەسـت ناو ژوورەکەی ڕێکخسـت و هەر شـتێکی لەجێگەی تایبەتی خۆی دانا، هەروەک ئەمڕۆ نا چەند سـاڵە ماڵە.. هەینێ گورج و گۆڵ چۆوە مــاڵی خــاڵی و لوقمە نـانێکی خوارد و غەریبی لە ئامێزگرتوو خوا حافیزی لە خاڵوو خاڵۆژنی کرد و ئەوانیش بەســــاردی بەڕێیان کرد، بەگم بە گورگە لۆقەیێک خۆی گەیاندە ماڵی نوێی و هەردوو پێی لێ ڕاکێشا و لە دڵی خۆی گۆتی (( ئۆخەی.. ماڵی خۆم لەهەموو جێیەکی خۆشترە)).

***

ئەو حەسارەی بەگم ژوورێکی تیا بەکرێ گرت یەکجار گەورە و فراوانە، هەژدە خێزان لە هەژدە ژوور جێگەو پێگەیان بوویتەوە، ژوورەکەی بەگم لە بنەبانێیە، ئەوەی تەنیشتی ماڵی چوکلێتە فەندییە کە بەخۆو بە سوعادی هاوسەری و ٦ کچ و کوڕێکی شەش حەوت ساڵە تیایدا ژیان بەسەر دەبەن، بەگم هەر زوو خۆی لە سوعاد نزیککردەوە و سیلەی ڕەحمیان بۆ یەکتر بزوا، سوعاد بۆ بەگم بووە دایک و خوشک و پشت و پەنای، هەرکە سبەینان دەچووە حەمامێ، پێشتر غەریبی تێر شیر دەکرد و دەینواند و لەلای سوعادی چوکلێتە فەندی بەجێدەهێشت، ئەویش فەرقی غەریب و کچ و کوڕەکەی خۆی نەدەکرد و گەلەک باش ئاگای لێدەبوو.

ئەم ژیانە تازەیەی بەگم، لە حەسارێ و لە حەمامەکەی مام حوسێن و دادە فەوزیە یەکجار نوێ و لەناکاو بوو، بەگم بەلێزانی خۆی هەوڵیدا زوو بەزوو لەگەڵیان ڕابێت و خۆی لەگەڵ بارە تازەکەدا بگونجێنێ.

کەشی حەسارێ یەکجار نامۆبوو بە ڕابردووی بەگم، ئەم حەسارە گەورەوگرانە یەک بەلوعەی ئاوی خواردنەوەی هەبوو کە لە ناوەڕاستی حەوشەی حەسارێ بوو و سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە و چێشت لێنان و خۆشۆردنی هەر هەژدە خێزانەکە بوو،سەبارەت بە خۆشووشتنیش هەر ژوورێک سەرشۆرێکی خۆی هەبوو، هەرکەسەو لە ژوورەکەی خۆی دەبووایە خۆی بشوات، لەمەش عەجایەبتر، حەسارەکە بەم هەموو ماڵە تەنیا یەک ئاودەستی هەبوو، هەر هەژدە خێزان دەبووایە لەوێ خۆیان بەتاڵ بکەنەوە... بەگم هەتا لەگەڵ ئەم بارودۆخە ڕاهات بەهیلاک چوو، دڵی بەوە خۆش بوو کە بۆ خۆشۆردنی خۆیی و غەریبی کوڕی ئەوە حەمام هەیە و حەوجەی بە سەرشۆرەکەی ژوورێ نییە، ئەوێی کردبووە

ناندێنێکی بچووک و تەباخ و مەنجەڵ و قاپ و قاچاغی تیا جێگیر کردبوو، سەبارەت بە کارەکەش لەناو حەمامیَ هەر باس ناکرێت، ڕۆژانە لەکاتی نۆبەتی ژنان ئەو هەموو ژن و منداڵە تێک دەقژقژان و بە ڕووتی و بەنیمچە ڕووتی، گەنج و پیر... چورچە و قەڵەو جوان و ناشـــیرین لە دەوری جوڕنەو ئاوی ســـاردو گەرم خڕدەبوونەوە و بە قیژە قیژ و دەنگی بەرز لەگەڵ یەکتر دەدوان، بەگم ڕۆژانە هەر پێیدەکرا ژنە بەشەڕهاتووەکان لەسەر جوڕنەی ئاویَ و خۆشووشتن لێکاتەوە و سەروتیتکیان لەناو دەستی یەکتر دەربینی.. بەگم لە حەمامێش ئاقڵی کرد و بەباشـــی زەینی خۆی دایە ئیشـــەکەی و خۆی لەگەڵ هەراو هۆریا و مەکری ژنەکان ڕاهێنا، سەری یەکێکیان دەشووشت عافیَتێکی بەگوێدادەدا و بەخشیشی خۆی وەردەگرت، منداڵی کچ و کوڕی دەشـووشـت و خاولیی لیَ وەردەپێچان و دەیبردنە دەریَ و جلکی پـاک و خـاوێنی لەبەردەکردن و گەرم گەرم دایدەپۆشتن هەتا دایکیان لەخۆشوشتن تەواو دەبوو دەهاتە دەریَ، دەرمانی موو پاککردنەوە (زەڕنیخ) ی بۆ ژنان دەگرتەوە.. گەر ژنێکیش بیپرسیبا:
ـ خوشکە بەگم دەرمانەکەت باشە، جوان خاوێن دەکاتەوە؟
بەگم یەکسەر باگۆی دەدایەوە، دەیگوت:
ـ بێخەمبە.. دەرمانەکەمان بە خـــوســـی لە موســـریَ ڕا هینایە، هەر وەکی پیفۆکی لێدەکات.
بنیادەم زووبەزوو لەگەڵ ئەم شـــوێنە ڕادێت کە تیایدا دەژی.. بەگمیش هەر چاوێکی کردبووە چوارچاو و ئیشـــەکەی خۆی خۆشـــدەویســـت و زووبەزوو لەهەموو وردەکاری پیشەکەی شارەزاو مەعلان بوو، بووە جێگەی متمـانەی هەموو ئەو ژنـانەی هـاموشـــۆی حەمـامێیـان دەکرد، دادە فەوزییەش ئیش و کاری بەگمیی بەدڵ بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ پتر پشـــتی

پێدەبەست و دەچووە ناو دڵی، هەروەک خوشکانیان لێهاتبوو، دادە فەوزییە ئەوەندە بەگمی خۆشـــدەویســـت لە یارمەتی و هاوکاری هیچ کاتێک کەمتەرخەمی لێنەدەکرد و بەزیادەوە چاوی لێی بوو.

بەگم ڕۆژ بەڕۆژ باشتر وەک ناتری حەمام لەگەڵ کارەکەیدا ڕادەهات، ئاخر جگە لە دەرمانی زەڕنیخ، شانە و لیفکە و پەشتەماریشی دەفرۆشتەوە مەعمیلەکانی و دادە فەوزییەش چاوپۆشی لێدەکرد، کێکی بە عەینەک و پسکیت و حەلقومی دەهێنا و لەناو حەمامی دەیفرۆشتەوە.. وردە وردە (غەریب)یش هەراش بوو بەســـەرپێیان کەوت و لەگەڵ خۆی دەیبردە حەمام، زۆربەی ڕۆژەکان دوای چۆڵبوونی حەمام و بەر لەوەی نۆبە حەمامی پیاوان بێت، بەگم جوان جوان غەریبی دەشـــووشـــت و جلکی دەگۆڕی و ئاوەکیشـــی بەخۆی دادەکرد و ئینجا هیلاک و ماندوو دەگەڕایەوە ژوور تەنیایەکەی لەناو حەساری.

***

لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار، بەگم سەرقاڵ و شارەزاو ناسراوتر دەبوو لەناو ژنانی گەڕەک و لە حەمامێ، غەریبیش هەراشـــتر و گەورەتر دەبوو، هەرکە تەمەنی گەیشتە شەش ساڵان، بەیانییەک بەگم دەستی گرت و بردی لە قوتابخانەی زانینی سەرەتایی ناونووسی کرد و بووە قوتابی لە پۆلی یەک.

ڕۆژێکیان لەســەر هاروهاجی مامۆســتایەک گوێی ڕاکێشــا و شەقازللەیەکی لە پشت ملی دا، ئەویش بە گریان هەر بەغار چۆوە ماڵێ و بۆ دایکی گێڕایەوە کە مامۆســتا لێیدایە، دایکی شــێت و هار بوو هەریکوتایە ســەر مامۆســتایەکە، چی خراپە پێیکرد و پەنجەی لێ ڕاوەشــاندن و بە مامۆســتاکەی گوت: نەخەرەتابی جارەکیدی لە کوڕی من بدەی، لۆ چما ئەفەندی ئەمن مندارم لۆ تو بەخێو کردییە.

لە هەینێوە غەریبیش هەر مـانگێـک هـاتوچۆی قوتـابخـانەی کرد، ڕۆژێک هەردوو پێی دایکی لە کەوشــێک ناو گوتی: ( بشــمکوژن ناچمەوە مەکتەبێ ) ئیدی وازی لە قوتابخانە و خوێندن هێنا... لەگەڵ ئەوەش کە هەر یەک مانگ قوتابی بوو، بەهیچ تاقیکردنەوە و دەرس و دەوەر و ســەعییەک ڕانەگەیشــت، بەڵام لەگەڵ برادەر و هاوتەمەنەکانی هەرکە لێک تووڕە دەبوون و دەبووە شەڕییان، پێیان دەگوت:

ـ بڕۆ هەی ساقیت.. ساقیتی مەکتەبێ.

بەگم بەردەوام چاوی لەســەر غەریب بوو لەگەڵ خۆی دەیبردە حەمام و لێنەدەگەڕا بەملا و بەولادا بچێت، زۆر جاران غەریـب لە پـاککردنەوە و ئیش و کـاری حەمـام یـارمەتی دایکی دەدا و لەنـاو ئەو هەموو ژنە ڕووتوقووتـانە تەکە تەکی کیری بوو هەڵدەســوڕا، هەموو ڕۆژێکیش دەبووایە لە ڕەحەتە لوقمە ســوورەکە چەند دانەیەکیان بخوات دەنا دڵی

دانەدەکەوت.. لوقمە سـوورەکە ببووە نانو ئاو و خۆراکی غەریب و لێی بێزار نەدەبوو.
دواجار دادە فەوزییە تێبینیی کرد کە غەریب گەورە بووە و کەڵکی ناو ژنانی نەمایە، بەڵام ئەوەندە بەگمی خۆشـدەویسـت دڵی نەدەهات لەم بارەیەوە هیچ قسـەیێکی لەگەڵدا بکات، کەچی وا ڕێکەوت ڕۆژێکیان دادە بەهییە کیژوکوڕەکەی لەگەڵ خۆی دێنێتە حەمام، ئیدی لەکاتی خۆشـوشـتنیان وای بەچاک دەزانی بەخۆی کیژەکەی بشـوات و کوڕەکەش بە بەگم بسپێرێ تا بیشوات.. کوڕەکەش ئاوزەی غەریبی بوو ئەگەر گەورەتر نەبێـت، هەرکە بەگمی بـانگکرد و داوای لێکرد کە کوڕەکەی بشوات.. بەگم لێیگەڕاوە و بە تووڕەیی گۆتی:
_ دادە بەهییە لۆ بەیەکجاری مام کاکۆی مێردیشـت نایینی با سـەری ویش بشۆم.
دادە بەهییە واقی وڕما و گوتی:
_ ئەیرۆ بەگم لۆ وەدەرێی خوشکم چ بووە؟
بەگم تووڕەتر و بە دەنگی بەرز گوتی:
_ ئەدی نابینی.. ئاخر کوڕەکەت گەورە بووە و کەڵکی ناو حەمامی ژنانی نەمایە.. نابینی کیری دەرێی دەسـکە جۆنییە!.. جارەکیدی ئەو زرتە زەلامەی نەینییەوە ناو ئەو هەموو ژنە ڕووتوقووتەی حەمامێ.
هەرکە حەمام چۆڵ بوو، بەگم ئەوەی ڕوویدا بۆ دادە فەوزیەی گێڕایەوە، هەینێ دادە فەوزییەش قافی قسەی هات و گوتییە بەگمی:
_ ئەدی ئەتو لۆ غەریبی دەینییە نـاو ئەو هەموو ژنە ڕووتوقوتەی؟ لەخوای ناترسێی؟

بەگم داما... سەری کز کرد، بە نووزەوە کە دادە فەوزییە بە ئاستەم گوێی لێبوو گوتی:

ـ ئەیرۆ دادە فەوزییە، غەریبۆکەی من هێشتا منداره... بۆنی شیری خاوی لەدەوی دێ.

دادە فەوزییە لەسەر ئەم فرسەتەی پاژنەدا و یەکسەر گوتی:

ـ بەگم، خوشکم غەریب منداری چییە؟ کیری دەرێی سەلکە بزۆتە.. با لەمەودوا لەگەڵ کامۆی کوڕم بچیتە نۆرە حەمامی پیاوان.

لەوڕۆژەوە غەریب ناو حەمامی ژنانی لێ حەرامکراو ببڕای ببڕ بەگم نەیدەبردەوە ناو ژنان، لەگەڵ کامۆی ڕێککەوتن سبەینان زوو غەریب ڕەحەتە لوقمە سووری دایکی لەباغەری بنێ و لەنۆرەی پیاوان بچێت خزمەت بکات و ڕۆژانەشی بۆ هەژمار بکرێت.

***

ڕۆژ بەڕۆژ غەریب گەورەتر دەبوو، بەگمیش سەرقاڵی حەمامی ژنان و ڕازیکردنی دڵی دادە فەوزیەی خاوەن حەمام بوو.
غەریبی پارچەڵە لە حەسار و لەناو کۆڵانیش ناوی بە کوڕێکی شەڕانگێز و تەشقەڵەچی ناسرا بوو، شەڕی بە داروبەرد دەفرۆشت، بەگم هەر پێیدەکرا سوڵحی بۆ بکات و لەگەڵ شەڕکەرەکان ئاشتی بکاتەوە.. لەگەمە و وەرزش و پێشبڕکێی ناو منداڵان هەر بەخۆی سەرکردە و فەرماندە و برا گەورە بوو... هاوشان لەگەڵ کوڕەکانی خەلیفە سەعۆی ( ئیسۆ و ڕەمۆ و ئیبۆ و مەمۆ)و کوڕە ئازایەکانی دیکەی گەڕەکی تەیراوەی، دەچوونە شەڕە بەردی قەڵات و تەیراوەی، چەند جارێک غەریب بە بەردی قەڵاتییان سەری دەشکێ و خەڵتانی خوێن دەکرێت.
لە کۆڵانیش غەریب وەها ناسرابوو کە نامەردی قبووڵ ناکات و سەرشۆڕ ناکات و ئامادەیە لەسەر هەق سەری خۆی دانێ.. عەسران لەگەڵ هاوتەمەنەکانی دەچوونە ناو قەسران و بەدزی ئەو پورتەقاڵانەیان لێدەکردەوە و گیرفانی شەڕواڵەکانیان لێپڕدەکردن و دەگەڕانەوە کۆڵانی خۆیان و بەسەر ماڵە هەژارەکانیان دابەش دەکرد.
هەر لەناو قەسران ئەفەندییەکی مڕومۆچ و ڕەشتاڵە دووجاران لەکاتی ڕنینەوەی پرتەقاڵە شۆڕبووەکەی سەردیواری ماڵێی دەمانچەی لێهەردەکێشان و غەریب و برادەرەکانی هەتا فلکەی گازینۆ عەنتەری ڕاودەنان.. عەسرێکیان هەرکە ڕێککەوتن بچنە ناو قەسران بۆ پرتەقاڵ دزینێ، (مەهدی)یش بەگەڵیان کەوت.. (مەهدی) هاوتەمەنیان بوو تازە لە موسڵێ ڕا بەهۆی گواستنەوەی باوکی کە نایب زابتی عەسکەری بوو ماڵیان هاتبووە تەیراوە و لە هەورازی ماڵی سەعدیە لۆری دوو ژووریان بەکرێ گرتبوو..مەهدی قوتابی بوو عەرەبییەکەشی باش بوو..

ئەو عەســـــرەی غەریــب گۆتی: مەهــدی برۆ لەکن ئەنوەرە کۆری قەڵەمەکی ئەســتووری ڕەش برە هەر لەســەر ڕێی خۆیان مەهدی لایدا و قەڵەمەکەی کڕی و هاویشتییە باغەری.. ڕۆیشتن هەرکە گەیشتنە ناو قەســران غەریب بەلای پورتەقاڵە شــۆڕبووەکانی ســەر دیوارانەوە نەچوو، یەکسەر چاودێریی ماڵی ئەفەندییە مرومۆچە و ڕەشتاڵەکەی کرد، کە زانیی خانووەکە چۆڵ و کش و ماتە بانگی مەهدی کرد، ئەو پارچە پلێتەی پێشاندا لە دیواری تەنیشت دەرگاکە هەڵواسرابوو... بە مەهدی گوت:

ـ ئەوە چ نووسرایە؟

مەهدی لە نووسینەکە نزیک بووەوە، گوتی:

ـ ئەوە بەعەرەبی نووسرایە.. مەسکەن حودیش خەڵەف چەلوب.

ـ دەزانم عەرەبییە.. پێشتر پرسیتم گۆتیان ئەو ئەفەندییە عارەبە و ڕەفیق حیزبییە و ڕکی دونیایێی لە کوردان دەبتەوە.. ئەوە مەعنای چییە؟

مەهدی گوتی:

ـ مەعنای.. ئێرە مەسکەنی حودیش خەلەف چەلوبە... مەسکەن یەعنی خانی.

هەینیێ غەریب داوای لە مەهدی کرد کە قەڵەمەکەی دەربینی و خاڵێک لەســەر میمەکەی دابنیێ، مەهدی لەگەڵ قەڵەم دەرهێنان و خاڵ لەســەر میم چەسپاندن پرسی:

ـ ئەوە کو دەزانی مەعنای چییە؟ خۆ ئەتو خیندەواریت نییە.

یەکسەر غەریب گوتی:

_مەراقم بوو بزانم ئەو نووســـینە چییە.. لەماریێ لە چوکلێتە فەندیم پرسی ئەو تێیگەیاندم گوتی نوقتەکی لەسەر میمی مەسکەنی دانیێ و شەڕەفی ئەفەندییە مڕومۆچ و ڕەشتاڵەکەی بشکێنە.
مەهدی خاڵێکی تۆخ و ڕەشی لەسەر میمەکە چەسپاند غەریب گوتی:
_ هەنوکە بخینەوە بزانم بووە چ؟
مەهدی خوێندییەوە:
_فسکەن حودیش خەڵەف چەلوب.
هەینیێ غەریب دڵی داکەت و یەکسەر بە برادەرەکانی گوت:
_ یەڵڵا ئینسیحاب.. ئەو چالاکییەمان بەسە – ئەڕۆ ڕەفیق حیزبییەکمان کردە فسکەن و شەڕەفیمان شکاند.
پاشتر غەریب بەم چالاکییەوە خۆی هەڵدەکێشا و کەشوفشی پێدەکرد.
هەر ئەو ماوەیە کە نیوەڕۆیان برسی دەبوو، سەرێکی لە کەبابخانەی مام وسو کەبابچی دەدا، کە لەسەرە کۆڵانی جادەی قەبرستان و مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشیدی بوو، لەوێ کەباب و ماستاو، لەلای مام ڕەسوول کلاولباد و مەغدید و مام حوسێن شەلاعیش نانی گەرم و لە چایەخانەی مەلا یاسین زرارییش چای خەست و خۆڵی بەلاش نۆش دەکرد و یەک فلسی وێر نەدەکرد.. ئەوانیش، مام وسو کەبابچی و مام ڕەسوولی نانەوا و مەلا یاسینی چایچی دەیانگوت:
_ بابخوا ســـەد ئەوەندەی قابیلە، کوڕە شـــەهیدە ... کوڕی شـــەهید عەتەوڵڵای تەیراوەییە، سەد ئەوەندەی قابیلە.. یاڕەبی نۆشی گیانی بی.
پاش عەسرێک، غەریب لەگەڵ سیرۆی مەجیدە خێل و ڕەمۆی خەلیفە سەعۆ و جەبارە ورگنی تەگبیر و ڕایان کرد و چوون چوار شووشە بیرە و

یەک کیلۆ ترێ ڕەشکەیان کڕی و چوونە ئاقاری ئەودیوی شێست مەتریی هەتا بخۆنەوە و خۆیان سەرخۆش بکەن.
ئەو ڕۆژە غەریب بۆ یەکەمینجاری بوو تامی مەی بکا... برادەرەکانی جگە لە بیرە لەپەناوە و دوور لەچاوی غەریب چارێکە عەرەقە مەستەکییەکانیان لەباغەری شەڕواڵی دەردەهێنا و هەتا قومەکیان لەبیرە دەدا دوو سێ مەسەی چاکیان لە عەرەقەکە هەڵدەقوڕاند.. غەریبیش هەتا شووشە بیرەیێکی فەریدەی تەواوکرد کیلۆ ترێی ڕەشکەکەی هەموو حەپەلووش کرد.. کەچی تەواو سەرخۆش و گێژو وێژ بوو، زوو زوو پێدەکەنی و میزی دەهات.. هەرکە تەواو بوون هەموو پێکەوە گەڕانەوە تەیراوە و بە ئاشکرا پێیانەوە دیار بوو کە سەرخۆشن.. غەریب بە پێکەنینی گرتبوو کە چووەوە ماڵێش هەر پێدەکەنی... بەگم زووبەزوو هەستی پێکرد و لەدڵی خۆیدا گوتی (( بەخوای قوزەڵقورتەکەی خواردیتەوە.. هەر لەوەمان کەم بوو!!)).
لەوڕۆژەوە ئەو شووشە بیرەیەی خواردەوە، ئیدی مەیلی چووە سەر مەی خواردنەوە و سەرگەرمکردن، هەر لەدوای بانگی عەسرێ، هەموو ڕۆژێک هەر کێی لەگەڵ با، پشتی ملی دەخوراند و دەیگوت:
ـ نەچین شتەکی بینین و دەومان تەڕکەین.
ئینجا چ بە تەنیا یاخود هاوەڵێکی لەگەڵ بووایە یاغر یاغر شۆڕ دەبۆوە بۆ فلکەی عەنکاوە، لەوێ بایدەداوە بۆ شەقامی دکتۆران، لەو دوکانە مەیفرۆشە بەژوور دەکەوت کە ڕێک لە ژێر باڕی سەنابل بوو، لەوێ چارێکێکی جنی سەرمۆر دەکڕی، هەوراز دەبۆوە لە دوکانی ئەنوەرە کۆری چوار پێنج ڕەحەتە لوقمی سووری لە باغەری شەرواری دەپەستا و شۆڕ دەبۆوە بۆ جادەی نەجاڕان و وردە وردە جنەکەی هەڵدەقوڕاند و

پارچە لوقمێکی بە ددان کەرت دەکرد و دەیکردە مەزە.. بەدەم خواردنەوە و پیاسـە چارێگە جنەکەی چۆڕ لێدەبڕی، تەواو مەسـت و سـەرخۆش دەبوو، هەینێ بەگەکی لێدەداو بەرەو حەسـاریێ بۆ لای بەگمی دایکی غلۆر دەبۆوە.. هەموو ڕۆژێـک ئەو جۆگەلە قوڕاوەی کۆڵان و بەر دەرگای حەسارێدا سەرەو لێژ دەڕۆیشت دەبووە کێشە، کە دەگەیشتە سەر جۆگەلەکە هێندە سـەرخۆش دەبوو چڵکاوەکەی لەبەرچاوی دەبووە ڕووبارە و بەدەم جوێندانەوە شـەقاوێکی یەکجار گەورە و بەرینی دەهاوێشـت و دەیگوت:

_ نازانم چ گەوادەک ئەو بەحرەی لە کۆڵانی مە دروست کردییە؟!
زۆر جاران پێی تێک دەئاڵا و شـڵپ دەکەوتە ناو جۆگەلە سـیان و قوڕاوەکە و لەبنی پێی هەتا تۆقی سەری دەبووە قوڕەشین.. ئاخر هەرکە سبەینان لە ماڵێ وەدەردەکەوت زۆر پاک و پۆشتە و پەرداخ بوو، کەچی ئێواران کە دەگەڕایەوە لە بەدمەسـتی لە پەڕینەوەی جۆگەکەی کۆڵانێ پێی تێک دەئاڵاو خۆی عەدم دەکرد، ئەوەندە لەناو جۆگەلەی کۆڵانێ **گەوزی** بوو و خۆی لە قوڕەشـین وەردابوو هەموو تەیراوە بە (غەریب مراوی) بانگیان دەکرد!.

# ٣

نۆرەی حەمامی پیاوان و ژنان جوایەز بوو، بەیانیان زوو حەمام بۆ پیاوان بوو هەتا بانگی نیوەڕۆیە، پاش بانگێش نۆرەی ژنان دەهات هەتا نوێژی مەغریبێ و لەگەڵ تاریکی حەمام دادەخرا.

هەموو ســـبەینان زوو غەریب لەخەوێ ڕادەبوو بە پەلەپەل نان و نۆک و لۆبیای دەخوارد و چایێکی بەســەردا دەکرد و دەچووە حەمامێ و دەســت بەکــار دەبوو، چونکە نۆرەی ژنــان لەپــاش کــاتژمێر یەکی نیوەڕۆ بوو، بەگم دەیتوانی کێشــتە خەوێکی باش بکات، کەچی هەموو بەیانییەک غەریب لەگەڵ دەنگی گریــان و لاوانــدنەوەی دایکی بە ئــاگــا دەهــات، دایکی هەستی پێدەکرد کە کوڕەکەی لە خەوێدا هەستاوە هەینێ چاوی بە فرمێســکی دەســڕییەوە و وای پیشــاندەدا کە هەرگیز نەگریاوە و ئەوە ئەو نەبوو لەخەوێی بەئاگا هێناوە.

غەریبیش یەکسەر لەناو جێ و بالینگانی هەڵدەستا و ڕاستەوڕاست بەرەو ئەو وێنە لەچوارچێوە نەگیراوە دەچوو کە بە بزمــارێکی ژەنگــاوی بە دیوارەوە هەڵواسرابوو.

وێنەکە هی شـــەهید عەتەوڵڵای باوکی بوو کە بەجلکی پۆلیســـی گرتبووی — وێنەیێکی تەڵخ و لێڵ، بەحاڵ ڕەنگ و ڕووخســاری باوکی بەدی دەکرا، ئیدی غەریب لەوێنەکە نزیک دەبووە و چاوی لەناو چاوی باوکە شـــەهیدەکەی دەبڕی و دەیدواند و بەبێ دەنگی و دوور لە چاوی دایکی چەند دڵۆپە فرمێسکێکی بۆ هەڵدەوەراند.

غەریب زۆر لەســـەر ئیشـــەکەی حەمامیێ نەمایەوە، بەڵام پەیوەندی و برایەتیی لەگەڵ کامۆی مام حوســـێن حەمـامچی نەپچڕاند.. بەدڵ یەکترییان خۆشـدەویست، دەشیزانی کامۆ بەرژەوەندیی ئەوی دەوێ بۆیە قەتـاو قەت لە قســـەی دەرنەدەچوو، کـامۆ چی گوتبـا ئەو دەیگوت بەسەرچاو ئەمر دەکەی.

ڕۆژ بەڕۆژ متووی مەیخواردنەوەی زیاتر دەبوو، دەمەو عەسران لای دەدا دوکانی ئەنوەرە کۆری ســێ کەرتە لوقمی ســووری لەباغەری شـەرواڵی دەپەستا و شـۆڕ دەبۆوە بۆ دوکانەکەی بن باڕی سـەبانل، لەوێ چارێگە جنێکی هەر بەپێوە هەڵدەقوڕاند و لە گیرفـانی شـــەرواری لوقمێکی دەردەهێنـا و لەداوە دەزوونی نـاو بـاخەڵی خـاوێن دەکردەوە و دەیـدایە بەر قەمپـاران، ئەوجا چـارێگێکی دیی هەڵـدەگرت و پـارەی وێر دەکرد و دەگەڕایەوە تەیراوەی... مەســەیێکی لە جن دەدا و قەمپارێکی لەو لوقمە سـۆرە دەدا کە بەداو و وردکە و پرتکە و توتنی ناو گیرفانی داپۆشـرابوو هەر خاوێنیشی نەدەکردەوە.

***

غەریب مراوی، زۆر متووی کامۆی حەمامچی بوو، هەردوو لا وەک برا یەکتریان خۆشدەویست، بەتایبەتی کامۆ زۆر سکی پێ دەسووتا و بەزەیی پێدادەهاتەوە و یارمەتیی دەدا، بەردەوام ئامۆژگاریی دەکرد بەڵکوو گەر واز لەمەی خواردنەوەش ناهێنێ با کەمی بکاتەوە و درەنگتر بخواتەوە، بەڵام هەیهۆ! لەگەڵ کێی بوو؟ مەحاڵ بوو ڕۆژێک غەریب بە ئایفی ببینی مەست و سەرخۆش نەبێت.

ماوەیێک بەیانیان زوو دەچووە حەمام و هاوکاریی کامۆی دەکرد، پاشان ئاوێکی بەخۆیدا دەکرد و لەگەڵ ڕۆژهەڵاتنێ جلک و بەرگی دەپۆشی و باژۆ بۆ لای نەقلیاتی، کامۆ بانگی دەکرد:

_ غەریب کێوە؟، لۆ وەها زوو!

غەریب بەپەلەپەل دەردەپەڕی و ئاوڕی لەکامۆی دەدایەوە و دەیگوت:

_ دەچمە کن نەقلیاتی، تەشریبە چەورەکەی عەزە تەشریبی لێدەدەم.

هەرکە کامۆ دەیگوت:

_ ئێ ئەوە بووە چ؟ لە تەشریبی عەزە تەشریبی بێزار نەبووی؟

غەریب مراوی، دەمارەکانی ملی ڕەپ دەکرد و دەیگوت:

_ حەیفت نەکرد، کو شێمە قەساب لە حەمامی سبەینان و گیپە خواردنێ بێزار نابی، ئەمنیش لە حەمام و لە تەشریبی عەزە تەشریبی قەت بێزار نابم — بەس ئەوەندە هەیە شێمە حەزی لە گیپەیە و ئەمنیش حەزم لە تەشریبییە.

***

کامۆ زۆر سەری دەکردە سەری کە کارێک بدۆزێتەوە و چیتر دەست لەبەر دایکی پان نەکاتەوە، عەیبە پیاو دەبێت بە ئارەقەی نێوچەوانی خۆی نان پەیدا بکات، غەریب شەوێک دایکی هەرپێچاو بە نیمچە شەڕێک پارەیێکی باشی لێسەند، هەرکە دایکی گوتی:

ـ لۆ چتە... پارەت لۆ چییە؟

گوتی:

ـ لەمەودوا ئیشێ دەکەم... خۆ هەر نابی چاوم لە دەستی توو بی.. لۆخۆم کاسبییەکی دەکەم.

دایکی پرسی:

ـ چ کاسبییەک؟ ئەتو چ ئیشەکی دەزانی؟

گوتی:

ـ ئەمن بەخۆم دەزانم چ ئیشەکی دەکەم، ئەتو تێکەری ئیشی من مەبە.

بۆ سبەینێ زوو لەخەوێ ڕابوو، پارەی لە تەنگەی باغەری ناو لێیدا چووە مەیدانی ئاژەڵان، لەوێ نیرەکەرێکی بە هەیبەتی کڕی و بەدوای خۆیدا کێشای لەناو بازاڕیش عارەبانەیێکی دوور و درێژی کڕی و کەروعارەبانەی لێک بەستەوە و خۆی هەڵدا سەر عارەبانە و لغاوی کەرەکەی توند کرد و باژۆ بۆ تەیراوەی.

هەرکە لێیان پرسی:

ـ ها غەریب ئەو کەر و عارەبانەیە چییە؟ لۆ چتە؟

بە دڵخۆشییەوە:

ـ لەمەودوا حەمباری دەکەم... لەجادەی تەیراوەی ڕادەوەستم هەر گەوادەکی مەوادی هەبیت لۆی دەگوازمەوە.. ئەدی ئەوە کاسبی نییە.

هەرواش بوو، ڕۆژانە خەڵکەکە کەم و زۆر شـــمەکیان پێدەگواســـتەوە و لەبەرامبەردا پارە و هەقی خۆیان دەداییێ.
ڕۆژێکیـان یەکێـک لەتـایەکـانی عەرەبانەکەی پەنچەر بوو، ئەو کـاتە پەنچەرچی هەر لەناو فیتەران هەبوو، ئیدی بە تەقە تەق و خواروخێچی کەروعەرەبانەی دا پێش خۆیی و باژۆ بۆ ناو فیتەران.
لەناو فیتەران یەکســـەر ڕووی لە دوکانی ســـمە فیتەری کرد، پێشـــتر ســـمەی دەناســـی ئەویشماڵیان لە تەیراوەی بوو، چوو کەرو عەرەبانەی لەبەر دوکانی ڕاگرت و بە هەشـــتاوی خۆی گەیاندە وەســـتای، هەرکە سمە چاوی بە غەریبی کەوت گوتی:
_ ها مراوی کوە وەکی ئەجندەی پەیدابووی؟
غەریب بە حەسرەتەوە گوتی:
_ کاکە سمە، ئاسن ئاسن، هەر ئاسن نییە ماری پیاوی کاول دەکات.
غەریب، هێشتا کاریگەری جن و رحەتەلوقمی شەوێی لەسەردا مابوو هەر ســـەرخۆش بوو، لەم کاتەدا ســـمەی فیتەر و شـــوفێرێکی خاوەن قەمەرەی خراپ بوو کە هێنـا بووی بۆی چـاک بکـاتەوە، غەریـب پەلەی بوو، ســـمەی فیتەر و شـــوفێرەکەش مشـــتومڕیان بوو کە چاککردنەوەی ترومبێلەکە چەندی پارە دەوێ.. ئاخر سمە و شوفێر برادەربوون و گاڵتەیان لەگەڵ یەک هەبوو، هەرکە شوفێرەکە گوتی:
_ مەیکە قەشمەری.. هەوکە پێم بڵێ بە چەندی لۆم چاک دەکەیەوە؟
سمە گوتی:
_ بەدە دیناری سۆر سۆر قەمەرەکەت بەگڕ دەخەمەوە.
ئەویش گوتی:
_ ناوەڵڵا پێنج دیناری شین شینت دەدەمێ چ حەپە حەپان مەکە.

سمه خۆی تووڕه‌کرد:

_ گه‌واد هه‌یه به پێنج دیناران ئیش له ترومبێلی ســـه‌قه‌ت و په‌قه‌ته‌ت بکا؟

شۆفێر:

_ گه‌واد ئه‌گه‌ر به ده‌یان بکات، به پێنچانیش هه‌ر پێی ده‌کرێ.

ئه‌و مشت و مڕه زۆری خایاند و غه‌ریبیش به دیاریانه‌وه ڕاوه‌ستابوو، ته‌واو لێیان ده‌هری بوو، له هیکڕا نه‌ڕاندی:

_ کوڕه به‌ســـه هه‌ی گه‌وادینه، به‌ســـه مه‌یکه‌نه به‌زمی خۆتان... ئاخر ئه‌میش ئیشم هه‌یه، ده‌مه‌وێ زووبه‌زوو تایه‌که‌م لۆ په‌نچه‌ر بکه‌ن.

ئه‌وان له حریته‌ی پێکه‌نینێیـان دا، ئینجـا ســـمه زووبه‌زوو تـایه‌که‌ی بۆ په‌نچه‌رکرد و ڕه‌وانه‌ی ته‌یراوه‌ی کرده‌وه.

ئه‌م کاسبیه‌ی غه‌ریب و که‌روعه‌ره‌بانه‌که‌ی خراپ نه‌بوو، پاره‌ی مه‌شرووب و ڕه‌حه‌ته لوقم و جۆش بۆ که‌ره‌که‌ی مســـۆگه‌ر ده‌بوو، ئیدی غه‌ریب کردبوویه عـاده‌ت به ڕۆژ حه‌مبـاڵی ده‌کرد و مه‌غریبـان به‌ر له تـاریکی ده‌چوو دوو چـارێگی عه‌ره‌ق و جنی ده‌کڕی و ده‌گه‌ڕایه‌وه مـاڵێ، عاره‌بانه‌که‌ی له‌به‌ر ده‌رگای حه‌ســارێ به‌جێده‌هێشــت و که‌ره‌که‌شــی هه‌تا بنه‌بانێ و پێش ده‌رگای ژووره‌که‌یان ده‌برد و له‌وێ ده‌یبه‌ســـته‌وه، هه‌ینێ ته‌شـــتێکی جۆ ده‌هێنا و چارێگه عه‌ره‌قه‌که‌ی هه‌موو تێده‌کرد و له‌به‌رده‌م که‌ره‌که‌ی داده‌نا.. به‌خۆشـــی ســـه‌ری چارێگه جنه‌که‌ی ده‌کرده‌وه و ورده ورده جنه‌که‌ی هه‌ڵده‌قوڕاند و گه‌زمێکی له لوقمه سووره‌که ده‌دا، هه‌ر ئه‌و کاتیش که‌ره‌که ده‌می له ته‌شـــته جۆیه‌که هه‌ڵنه‌ده‌گرت هه‌تا هه‌مووی هه‌ڵـده‌لووشــــی، ئینجـا به‌زم خۆش ده‌بوو، غه‌ریـب و که‌ر هه‌ردووک ســـه‌رخۆش، غه‌ریب به ده‌نگه نه‌شــازه‌که‌ی ده‌می داده‌پچڕی و گۆرانیی

دەگوت، کەرەکەش لەسەر هەوای گۆرانییەکانی غەریب دەستی بە زەڕەزەڕ دەکرد، خەڵکی حەسارێش دەدڕان لە پێکەنینان.

***

دونیای حەسارەکە دونیاییێکی یەکجار عەجایەب و سەیروسەمەرە بوو، حەسار لەناوەوە وەک بازنەییێکی ناڕێک هەڵکەوتبوو، کە بە هەژدە ژوور دەورە درا بوو، هەر ژوورە و خێزانێک بە کرێیان گرتبوو، هەڤدە سەرخێزان لە هەڤدە ژوور گوزەرانێکی کولەمەرگییان بەسەر دەبرد، ژووری لای دەرگای گەورەی حەساریٚ نیچمە ڕووخاو و تەپی بوو بە کەڵکی ژیان و دانیشتن نەدەهات... هەر هەڤدە سەرخێزانەکە بە بەلوعەییێکی ئاو کە لە ناوەڕاستی حەساریٚ قیت کرابووەوە بەشە ئاویان بەبەر دەکەوت.. لە بنەبانێش ئاودەستێک دەرگاکەی بە گوێنی داپۆشرابوو هەر هەموویان لەویٚ دادەنیشتن و ئیسراحەتی خۆیان وەردەگرت.

ژوورەکانیش ئاوا دابەشکرابوون و کرێچییان تێدا بوو، لەبنەبانیٚماڵی بەگم و غەریبی کوڕی، کە هەر بەگم بەخۆشی سەرکار و سەرپەرشتیاری حەسارەکەش بوو، هەمووان لەگویٚ و حەمدی ئەودابوون.

لە تەنیشتەوان ماڵی [ (چوکلێتەفەندی و ژنی) ئیدی ماڵەکانی دی (مامە توشە، عەبە تاشەبەرد، کەریم هەلهەلە، سەیدە فشە (سەید عەبدولقادر)، مام دەروێش، نەنە سۆتیٚ (بەتەنیا)، بەگمە سۆر و مێردە سەقەتەکە و ئەوانیدی بوون) ].

غەریب بەڕۆژ کەم دەکەوتەوە حەساریٚ.. ئەو لەدەرەوە دەماوە و مەیدەنۆشی و لوقمی دەمەزاند و مەست و سەرخۆش، شەوان دەگەڕایەوە ماڵیٚ، لەناو حەساریٚ بەینی لەگەڵ چوکلێتە فەندی زۆر خۆش بوو زۆر جاران بە شەو دادەنیشتن و قسەی خۆشیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، لە تەلەفزیۆنە کوردییەکەی کەرکوکیش سەیری تەمسیلییەکانی عەلییەفەندی و وەستا عەلی و ڕەجەب پاقلەخۆریان دەکرد..لەگەڵ کەریم هەلهەلەی بەینی خراپ نەبوو، ئاخر هەر ئەویش ناوی لەکەریم نا هەلهەلە، چۆن؟،

ئەوە ڕۆژێـک کەریم دەچێتە لای حەمەڕەحیمی پـاسـکلیچی و بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشێکی خۆی پاسکیلێکی لێ بەکرێ دەگرێ، پاسکیل چ پاسکیل، حەدبای ڕەش بیست و چوار هەر زێنەت بوو لێیخوڕی، لەوەش خۆشتر جەڕەسێکی بە سوکانییەوە بەسترابوو هەلهەلەی لێدەدا، زەنگێکی تازە بوو کەم کەس دەیتوانی بیکڕی و لە سـوکانی پاسـکیللەکەی ببەستی، چونکە لەوانیدی گرانتر بوو، ئیدی کەریم ئیشی بە پاسکیلەکە تەواو دەبێت و دەگەڕێتەوە لای حەمەڕەحیم تا بیداتەوە، کەچی دوکانەکە داخراوە و حەمەڕەحیم لە چ کون و قوژبنان دیار نییە، بەناچاری پاسکیلی هیناوە ناو حەسـارێ و لەبەر دەرگای خۆیان ڕایگرت.. ئیدی منداڵی جیرانان دەهاتن و زەنگەکەیان لێدەدا و دەنگی هەلهەلەی بەرز دەبۆوە، نە هەلهەلەک و نەدوو گەورە و گچکە ڕژانە ناو حەوشـەی حەسـارێ و بەدیار پاسـکیلە بە هەلهەلەکەوە دەتریقانەوە، لەو دەمیدا غەریب بانگی کرد و گوتی:

_ کەریم.. کەریم هەلهەلە وەرە ئەو پاسـکیلەمان لەکۆڵ کەوە خەومان دێ.

ئیدی نازناوی کەریم هەلهەلەی بەدووکەت و بووە کەریم هەلهەلە. غەریب زۆر کەیفی بە سـەیدە فشـەی نەدەهات، ئاخر سـەیدە فشـە جگە لەوەی دووڕوو و درۆزن بوو، بوختانیشـی هەڵدەبەسـت و مەراقی بوو خەڵکی ناو حەسارێ تێک بەربدات بەخۆشی پێیان پێبکەنی. هەر لەبەر هەندێ غەریب نەیدەحوباند و کەیفی پێ نەدەهات و ئەوەندەی نەدەدواند. ئاخر لەدەمی خەڵکی حەسارێی بیستبۆوە کە سەیدە فشە لەم لاو لەولا زەمی کردییە و بە توندی غەیبەتی کردییە.. ئیدی ئەو ڕقەی هەر لێ هەڵگرتبوو تا ئێوارەیێکیان غەریب و کەرەکەی سـەرقاڵی دەمتەڕ کردن و

لەهەوای خۆیاندا بوون، نەرمە نەرمە کەر زۆڕەی دەکرد و هێواش هێواش غەریبیش بۆی وەردەگرتەوە.. لە پڕ سەیدە فشە پەیدا بوو بەناو حەوشەی حەسارێدا کەوت، غەریب دانتری سەرخۆش، هەرکە گەیشتە لای ئەوان کەرەکە زەڕینێک زەڕی دەتگوت ئەویش ڕقی لە سەیدە فشەی دەبتەوە، غەریبیش سەری هەڵبڕی و بەدەم گاڵتە و قەشمەریاتەوە بەسەر کەرەکەیدا هەڵدەگوت:

_ ئۆخەی کەرۆکێ کەرۆکێ.. سـمێر قەیتـان، ئەبرۆ کەوان... خۆشمدەوێی کەرۆکێ.

هەینێ سەیدە فشە لەجێی خۆی چەقی و بەغەزەبەوە سەیری غەریبی کرد و گوتی: _ باشت میقات کردییە!!

غەریب یەکسەر هەڵساوە سەرپێ و باگۆیداوە:

_ کەیفم لێبی ئەتوش میقات دەکەم.. بەسەری داکم وەهات لێدەکەم هەر لەخۆتەوە ڕاقیسەی بکەی.

بەڕاستیشی بوو، غەریبۆکە هیچ کاتێک سوێندی بەسەری دایکی بە هەوەنتە نەدەخوارد، کە بیگوتبا بەسەری دایکم ئەگەر خۆشی لەسەر دانابا ئەوە نەیدەهێشت سوێندەکەی بەدرۆ دەرچێت.

ئیدی بووە دەنگە دەنگیان، لەم کاتەدا بەگم هاتە دەرێ و پەنجەی لە سەیدە فشەی ڕاوەشاند و پێی گوت:_ گێ بدێ سمێر قەترانی ( ئاخر سەید سمێڵە گەورەکانی ئەوها ڕەش دەکردەوە دەبریقایەوە) نەرێی سەیدم و ئەولادی ڕەسولم.. لێت قبور ناکەم تەشقەرەی بە غەریبی کوڕم و کەرەکەی بکەی... دەنا بە کەرانت بەگان دەدەم.

***

غەریب وردە وردە مەیلی کەروعارەبانەکەی دانا، پاشـــان کەس نەیزانی کەرەکە بۆ کوێنـدەرێ هەرەتە بوو و عـارەبـانەکەش چی لێهـات، دوو برادەری تازەی گرت حیسـابی کەرو عەرەبانەکەی بۆ دەکردن، سـیرۆی مەجیـدە خێلی لە جیـاتی کەرەکەیی و جەبـارە قەڵەویش عـارەبـانەکە، سـیرۆش وەک ئەو بیســـت و چوار سـەعات و موعەدەل دانتری بوو، هەرسـێکیان بەیەکەوە دەیانخواردەوە و سـەرخۆش دەبوون و بەزموڕەزمیان دەخولقاند.
عەیامەک بوو، غەریب لەو بەری بەستێ لە ماڵێکی پەڕگەی کۆڵانێ کچێکی جوانی دیتبوو بە دڵ عاشـقی ئەو کچە بوو بوو هەر چۆنێک با ڕۆژی جارێک بە کۆڵانەکەیاندا دەڕۆیشت تا هەر هیچ نەبێت چاوی پێ بکەوێت ئەگەر چی نە ناوی دەزانی و نە قسەشی لەگەڵدا کردبوو.
ئێوارەیەکیان لەکاتی دەم تەڕکردن و خواردنەوەدا غەریب دەستی بە گریان کرد، گریـانێک گریـا کەس بۆ مەرگی ئازیزانیش بەم جۆرە ناگریێ.. سـیرۆ و جەبارە قەڵەو تەنگاو بوون وایانزانی غەریب شـتێکی خراپی لێ قەوماوە.. ئیدی سەریان خستە سەری وگوتیان:
_ هەر دەبی پێمان بڵێی لۆ دەگریێ ... چت لێ قەومایە؟کێ غەدری لێکردی؟ بەس پێمان بڵێ کێیە با بچین خوشکی بگێین.
هەرسێک دەستیان لە ملی یەکتر کرد و دەیانخواردەوە و دەگریان تا هێور بوونەوە، ئینجا غەریب دەردە دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتن و گوتی:
_ بەسەری داکم ئەو غەددار داکە هەرچەندە چ قسەشم لەگەڵ نەکردییە و ناویشی نازانم بەس ئەمنی شێت و شەیدا کردییە.

سیرۆ بە پرسیاران بەتەواوی پێکەوت کە کچەکە ماڵیان لەکوێیە و کامە خانوو هەوە و کیژی کێیە.. بۆیە دەستی بە پێکەنینێ کرد و بە غەریبی گوت:

ـ حەیوان ئەوانە تورکمانن.. خۆ ئەتو تورکیش نازانی... ئەدی کو دەتەوێ قسەی لەگەر بکەی؟

ـ چ ... بەس قسەم لەگەڵ بکاتن، بەسەری داکم بە یەک سەعاتی فێرە تورکی دەبم و مەحتەل نابم.

هەرکە ئارەق و جنەکانیان چۆربڕ کرد، هەرسێکیان بڕیاریاندا بچنە لای ماڵی یاری غەریبی و سۆراغێکی کچەکە بکەن... چوون هەر لەو کۆلانەکە نزیک بوونەوە بینیان کۆڵان قەرەباڵغە و هەراو زەنایەکە کەس بە کەس نییە، ئاهەنگی بوک گواستنەوە بوو لەو کۆڵانە، ئەوانیش چوونە ناو ئاپۆڕەی خەڵکەکە.. غەریب چاوی لە گڕاوییەکەی خۆی دەگێڕا و لە هیکڕا کەوتە بەر چاوانی.. هاواری لە سیرۆ کرد و گوتی:

ـ سیرۆ.. ئەوەتە ئەو حۆرییەی دەڕێم.

سیرۆ بە شێنەیی لە کچە و دەستەخوشکەکانی نزیک بووەوە و گوێی ڕادێرا تا بزانن چ دەڵێن.. سیرۆ زیاتر گوێبیستی ناوی ( گولخاتر) بوو، بەڵام نەیدەزانی کامەیان گوڵخاترە.. یارەکەی غەریب یان کچێکی تریانە.. زیاتر لە کچەکە نزیک بووەوە بە تورکی گوتی:

ـ سەن ئادو گولخاترد.

کچەکە بە ترس و شەرمەوە گوتی:

ـ باللا

سیرۆ گوتی:

ـ نەنەو سان وچاغر.

ئیدی سیرۆ و غەریب و جەبارە قەڵەو پاشەکشەیان کرد و لە قەرەباڵغییەکە هاتنە دەرێ.. سیرۆش توند توند دەستی غەریبی گرتبوو دەیگوت:

_ پێت برێم ناوی چییە؟

غەریب تەنگەنەفەسە:

+ دەبری... دەبرێ بزانم ناوی چییە؟

_ ئاخر ئەگەر پێت برێم چم لۆ دەکەی؟

+ کورە چت دەوێ لۆت دەکەم... سبەینێ چارێگە عەرەقەکت عایەدی من بی.

_ ئاخر سوندەکی گەورە بخۆ.

+ لۆ بەخۆت نازانی ســــوندی گەورەی من بەســــەری داکمە.. کاکە بەسەری داکم عارەقی سبەینێت عایەدی منە.

_ ناوی... ناوی ... گوڵخاترە.

+ ئەڵڵاە... ئەڵڵاە... گوڵخاتر... ناوی یارم گوڵخاترە.

جەبارە قەڵەو بە دەنگە گڕەکەی گوتی:

_ ئای ترحێو غەریبۆکە.. جارێ لەفزی لەگەر لەفزی نەجوولایە پێی دەرێ یارم!!

هەرسێکیان تێر تێر پێکەنین.

***

چەند جارێک سیرۆ و جەبارە قەڵەو خۆیان لە غەریبۆکەی دەدزیەوە و بەدووان دەچوونە ئەگلەنجە و ئاهەنگی بووک گواستنەوە لەماڵان، هەرکە بە ڕۆژیش چاویان بە غەریبی دەکەوت دەبووە باس باسی ئەگلەنجەی شەوێ و ئەو گەنجە دەنگخۆشە عاشقەی ناوی (فەرهاد زیرەک) بوو، ئەوەندەیان بەتام باس دەکرد غەریب واقی وڕدەما و مەراقی بوو جارێک ئەویش لەگەڵیاندا بچێت و بزانێ چ بەزمە.

شەوێک، سیرۆ پاش ئەوەی دانتری سەرخۆش بوو لابەلا جەبارە قەڵەوی تێگەیاند و بڕیاریاندا ئەمشەو غەریبۆکەی لەگەڵ خۆیاندا ببەنە ئەگلەنجەی، هەرواشیان کرد، هەرسێکیان تا تەواو مڕبوون عارەقیان هەڵقوڕاند، غەریب زیاتر سەرخۆش بوو، کە تەواو فوول بوون، سەرو چارێگەک جنیان لە باغەری شەروالی پەستا و چوونە ماڵی سابیر سەماوەری، ئەمشەو ئاهەنگ و ئەگلەنجەی دڵشادی کوڕی بوو لەسەر بانی خانووەکەیان.

هەرکە گەیشتن، دەمێک بوو مەولوود خوێندرابوو و بەزم و ڕەزمی خواردنەوە و مەزەو مێز ڕازاندنەوە و تەدارەکی موسیقاژەنەکان سازکرابوو، سەدا و ئاوازی مۆسیقا سەرتاپای کۆڵانی تەنیبوو، گەنجەکان لەسەر مێزەکان دابەش بووبوون و سەقاڵی خواردنەوە و دەمتەڕکردن بوون، کۆمەڵە گەنجێکیش کە ئەهلی خواردنەوە نەبوون جگەرە بەدەستەوە بەدیار فەرهاد زیرەک کۆمەڵیان بەستبوو زوو زوو قومیان لە جگەرەکانیان دەدا و دووکەڵیان بەبا دەکرد... بەزمێک خولقا بوو کەس ئاگای لەکەس نەبوو.

هەرکە ئەوان گەیشتنە سەریان، فەرهاد دەیچریکاند و هەورازە و هەوراز بە دەنگێکی بەرز و غەمگین بە بە مەقامێکدا هەڵدەگەڕا، ئەوەی دەیگوت نەیدەگوتەوە ڕێز ڕێز فرمێسک لەهەردوو چاوە جوانەکانی بەسەر ڕیشە

ڕەشـە قەترانییەکەی زەنگوڵیان بەسـتوو، حەشـاماتی سـەربانیش ئەوەی دەگریا و لە بابەڕۆی دەدا، ئەوانیدی بەمووس و کەتەر خۆیان بریندار و عەدم دەکرد، هەندێکیش بە چەپەڵۆکان لە سـەر و گێلاکی خۆیان دەدا و چریکەی فەرهادیش بە گوڕتر حەوت تەبەقەی ئاسمانی دەبڕی.
غەریبۆکە سـەرسـامە، نەیزانی ئەگلەنجە ئەوهایە، عەیامێک سـامگرتوو لە دڵی خۆیـدا گوتی: ئـای لەو دەنگە ئـاسـمـانییەی... هەڵڵا هەڵڵا ئەستێرە دەربارەی و دڵ و دەروونان ڕۆشـن دەکاتەوە و کانیی فرمێسکان دەتەقێنێتەوە و ڕۆندکان بە جۆگەلە دەکات. پاشان وردە وردە هاتەوە هۆش خۆی، نەرمە نەرمەش مەسـەی لە چارێگە جنەکەی دەدا و دەسـتی لە بـاغەری شـەروالی ڕادەکرد و قیچۆکەکی لە لەتە لوقمە گەورەکە دەکردەوە و دەیمەزاند.. تەمەنای دەکرد دەیگوت: خوایە ئەمشـەو ئاگات لێمبی با زوو بەزوو عەیارم هەرنەیێ.
فەرهادیش، زیرەکانە مەقامە خەمناکەکەی کۆتا پێهێنا و کردییە بەستە ( گوڵخاتر خاتر ئەی چاوڕەشـی ئەبرۆ کل، هەموو هەولێر دەزانی نییە لە تۆ جوانتر) چەنـد بـارە بوونەوەی ئەم کۆپلەیە، گوڵخـاتر و ئەو سـەدا زەنگوڵییەی دەنگی فەرهاد و قوم لەسـەر قوم هەڵقوڕاندنی جنەکە، غەریبۆکە بە دەسـت و بەپێ و بەهەر چوار پەلان کەوتە هەڵەکە سـەما، فڕی بەسەر دەورووبەرەوە نەما، بەحاڵ چاوی بۆ دەکرایەوە و تارماییەکانی دەبینی، هێدی هێدیش خۆی لەبەردەم تیپی مۆسـیقا و فەرهاد نزیک دەکردەوە و لێکە لێکەش قومی لە جنەکەی دەدا و لەتە لوقمێکی دەخسـتە ناو دەم.. هەتا بە تەواوی بەدەم ڕەقس و سـەما فول دانتری بە مەی نـا بەدەنگە ئـاسـمـانییەکەی فەرهـاد گەیشـتە بەردەمی و بە چەپەڵۆکان و لەسەر نەزمی ئاوازی (گوڵخاتر) لە تەپڵی سەری خۆیدەدا

و دەگریا و لە بابەڕۆی دەدا و باوەشی خۆشەویستیی بۆ فەرهاد کردەوە، هەینێ فەرهادیش وەک هەمیشــە بە ســۆز و خۆشــەویســتییەوە هەردوو باســـکی بۆ کردەوە و لە باوەشـــێ کرد و هەوڵیدا هێوری بکاتەوە، غەریبۆکەش گەرمتر و بە گوڕتر هەڵدەپەڕی و دەگریـا و چوار پەلی دەکوتـا، ســـەری چارێگە جنەکەی کردەوە و ویســـتی قومێکی تر هەڵقوڕتێنێ، کەچی لەنێوان دەستی خۆیی و دەستی فەرهادی چارێگە جنەکەی پەڕی و کەوتە سەر چیمەنتۆی ئەرزەکەو شووشەکە هەلاهەلا بوو، فەرهادیش مشەوەش بوو نەیدەزانی ئیتر چی ڕوودەدات، غەریبۆکەش کێشـکە ئاسـا هەڵدەبەزیەوە.. زوو بەزوو فەرهاد باسـکی خۆشـەویسـتی لەملی غەریب ئاڵاند و ماچی کرد، غەریبۆکەش دەگریا و دەســـتی فەرهادی ڕادەمووسی و هەڵدەپەڕی و مۆسیقاش هەر بەردەوام بوو.

فەرهـاد زیرەکـانە بـانگی یونس قەلعەی برادەری کرد و تێیگەیـاند کە قەرەبووی چارێگە شـکاوەکەی بۆ بکاتەوە، قەلعەش بەهێواشـی دەسـتی غەریبۆکەی گرت و بردییە پەنایێکی دوور لە چاوان و بە قســەی خۆش کەمێک هێوری کردەوە و دە دیناری سووری لە مستی ناو پێی گوت:

ـــ هەڕوو، یەک قـاپ جنی بکڕە و وەرەوە، فەرهـاد وەهـا زوو خەلاس نابی، لەبۆ مەشـروبیش بێخەمبە هەتا شـەش مانگیدی لەسـەر ئەمری فەرهاد زیرەکی گەورە ئەتو مەشروبت عایەدی منە.

غەریب سەری بادا و ویستی پارەکە ڕەتکاتەوە:

ـــ کاکە پارەم پێیە بەسەری داکم ....

یونس قەلعەش قسەکەی پێ بڕی:

ـــ دەتەوێ فەرهاد لێمان عێدزبی.. بڕۆ بەقســـەم بکە.. با فەرهاد زەوقی تێکنەچی.

له هەینێوە غەریب بووە مورید و دەروێش و عەبدی فەرهادە دەنگ غەریبەکەی هەولێریان، کون بەکون، گەڕەک بە گەڕەک دەگەڕا لە کێندەرێ شاهەنگ و ئەگلەنجە هەبا دەچوو و لەبەردەم فەرهادەکەی خۆی چۆکی دادەدا، گەر سەرخۆشیش با ئاقڵ ئاقڵ بەبێ دەنگی فرمێسکی هەڵدەڕشت و نقەی لەخۆی دەبڕی.

# ٤

نزیکەی مـانگێـک دەبوو بەگم گڕوتینی جـارانی نەمـابوو، زوو زوو هەستی بە ئازارێک دەکرد لەناو هەناوییەوە هەڵدەقوڵا و بەسک و پشتیدا دەچۆڕا، ڕۆژێک دەچووە حەمام دوو ڕۆژان لەژووریَ لەتاو ئازاری سک دەگەوزی.. غەریبیش لەبەر بەدمەستی و خواردنەوە و قەشمەریات ئاگای لە هیچ نەبوو، تا ڕۆژێکیان هەســـتی کرد بەگمی دایکی ڕەنگ و ڕووخســـاری جارانی نەماوە و زۆر بێتاقەتە.. پرســـی دایە چتە بۆ ئەوها بێتاقەتی.. هەرکە بەگم درکاندی نەخۆشـــە و ئازاری هەیە، غەریبۆکە گریانێک گریا مەگەر بۆ ئازاری دایک وا بگری.. ئێوارە بوو خۆی کۆکردەوە و شـەقێکی لە قاپە عەرەقەکە هەڵداو زەرفە لوقمە سوورەکەی ڕێک خستە ناو جۆگەلەی حەوشی حەساریَ.. چوو محەمەد غەفوری هێنا و بەگمیان خســـتە ناو قەمەرە و بردیانە لای دکتۆر عەبدولڕەزاق دەباغی هەولێری.. لەویَ پاش پشـــکنین و لیَ وردبوونەوەی و پاشـــان ناردیانە سۆنەر و ئەشیعەشیان بۆی وەرگرت، دەرکەوت بەگم کیسەیێکی گەورەی ئاو لەناو سکیدا هەیە و دەبیَ بە نەشتەرگەری ڕزگاری بکەن.
ســـبەینەکەی بەگم لە نەخۆشـــخانەی جمهوری خەوێندرا و تەدارەکی نەشـــتەرگەری ئـامـادەکراو چـاوەڕوانی دکتۆربوون، ئیـدی دکتۆر عەبدولڕەزاق هات و بەگمیان بردە ژووریِ نەشـــتەرگەری و غەریبۆکەیان لە ساڵۆنی چاوەڕوانی هێشتەوە تا بۆ قوڕبەسەری و بێکەسی و ماڵوێرانی خۆی بکەوێتە شین و واوەیلا.

پاش نیوەڕۆکەی، ڕێکەوتی (١٢/١٠/١٩٨٠)، هێشــــتا بەگم بەتەواوی بەنج بەرینەدابوو و هەر وڕێنەی دەکرد، غەریبۆکەش بە غەریبی لە پشت سەری دانیشتبوو سەبر سەبر نێوچەوانی دەشێلا، لەپڕ بووە هات و هاوار و بینەو بەردەیێک هەموو قاوشــــەکە تێک قژقژان، چەند کەســــێک قەرەوێڵەیێکی بە پێچکەداریان پاڵدەدا کە گەنجێکی لەهۆشــــخۆچووی لەسەر پشت پاڵکەوتبوو، ئیدی بە وەرە ئێرە و نا ئێرە باش نییە با لەبەردەم ئەم پەنجەرەیە بێت، گەنجەکەیان بە چوار پەلان هەڵگرت و خستیانە سەر قەرەوێڵەیێک، غەریب بەپەلە چوو سەیرێکی ڕووخساری نەخۆشەکەی کرد، لەهەمان کات بووە فڕکان فڕکانی برین پێچ و دکتۆرە موقیمەکان، ئاویان بۆ هەڵواسی و دەرزیان لێدا و ئامێری هەناسەدان و ئۆکسجینیان بۆ دانا.. خزم و کەسی گەنجەکەش مشەوەش و خەمبار دەهاتن و دەچوون و لە برین پێچ و پەرستار و دکتۆرەکان دەپاڕانەوە.

غەریب، بەگمی بەجێهێشـــــتوو و، کەوتە ناو ڕاکە ڕاکەی ئەو خەڵکە و مەبەستی بوو هەر چۆنێک بێت یارمەتییێکی خزم و ناسیاوی ئەم گەنجە بێهۆشە بدات.

غەریـــب هەرکە زەینی دایێ، دیتی کچێکی عـــازەب لەهەموان بە کولافەترە و دەگری و شـــینێ دەکات، لێی نزیک بووەوە، لە دەرفەتێکدا لێی پرسی:

_ ئەو گەنجە غەریب نییە، زۆرم دیتییە.. ئەوە کێیە؟ چی تووە؟ چی بەسەرهاتییە و لە کێندەرێ وای لێ هاتییە؟

کیژە چاوبەفرمێسکەکە گوتی:

_ ئەدی کو هەی کۆرەبم لۆت برام.. ئەوە غەریب نییە... ئەوە ســـوبحی کۆیی هونەرمەنـــدە.. ئەوە ڕۆشــــۆی چرمن و مەنیجی بەربووکە...

هەردووچاوم کۆرەبی ئەورۆ لەڕێی کۆیە و لەکاتی گەڕانەوەی لۆ هەولێر ترومبێلیان وەرگەڕایەوە و ئەوەای لێهاتییە.
شـــەوێ (ســـوبحی) هەر بەبێ هۆش مایەوە و تەنها هەناســـەی دەدا و جارجارەش ئاهێکی هەڵدەکێشـــا کە لە گمەگمی کۆترێکی بریندار دەچوو، دکتۆرێکی عەرەبیان هێنا فەحســـی کرد و هەر ســـەری بادەدا، پاشان گوتی: خوا ڕەحمی پێبکات.. تەمەن بەدەست ڕەبولعالەمینە.
خزم و کەس دەســـتە دەســـتە دەهاتنە ســـەری و بەچاوی فرمێســـکاوییەوە قاوشـــیان بەجێدەهێشـــت و دەچوون لە حەوشـــەی نەخۆشـــخانەی کۆمەڵ کۆمەڵ گرد دەبوونەوە، درەنگی شەوێ هەواڵێک گەیشت گوتیان: ئێستا دکتۆر نافیع ئاکرەیی دێ و فەحســـی دەکات، حەمەدەمینی مامی زۆر پەرۆش بوو گوتی:
_ دەی بەتەمای خوای گەورە.
هێندەی پێنەچوو دکتۆر ئاکرەیی هات، زۆر بە وردی فەحســـــی کرد و لەگەڵ دکتۆرە موقیمەکان بە زمانی ئینگلیزی کەوتنە گفتوگۆ، دواجار دکتۆر نافیع بە کزیو داماوی قاوشەکەی بەجێهێشت، مامە حەمەدەمین و شـــــلێر و خزم و کەس و برادەرە هونەرمەندەکان و غەریبیش لەگەڵیان کەوتنە دوای دکتۆر نافع... لە حەوشـــــە بەر لەوەی دکتۆر چ قســـــان بکات، مامی سوبحی گوتی:
_ کاکە دختۆر ئەگەر دەزانی خەتەرە لێرە عیلاجی نییە، هەر ئێســـــتا دەیفرێنم و دەیگەینمە موستەشفای توبی بەغدایێ.
دکتۆر نافع هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا و وەڵامی داوە:

_ مامە گیان.. ئەو کوڕە تووشی نەزیف داخیلی بووە و خوێن لەسەری ڕاناوەستی و دایتییەوە هەناوی، نەک بەغدا بیبەیە لەندەنیش لەو چارەسەرەی لێرە لۆی دەکرێ زیاتر نییە.

مام حەمەدەمین بەگریانەوە پرسی:

_ ئەدی چ بکەین؟ چارە چییە؟

دکتۆر :

_ چاوەڕێی کەرەمی خوای بکەن... من وەک دکتۆرێک پێتان دەڵێم ئەگەر ئەو خوێنبەربوونەی ڕانەوەستی هەر چەند سەعاتەکیدی دەژی... ڕەنگە بەرەبەیانێ ماڵئاوایی بکا.

نە دوعای سەبیحەی هاوسەر و نە نزای شلێری خوشک و نە پاڕانەوەی دایک و باوک و مام نە دەرمان و چارەسەری نەخۆشخانەی جمهوری و دکتۆرەکان گیرۆ نەبوون. ئەم هونەرمەندە ڕووحسووکە لە بەرەبەیانێکی زووی (١٩٨٠/١٠/١٣) دوا هەناسەی سپارد و لە گمە گم کەوت و خامۆش بوو.. ئیدی بووە شین و شەپۆڕ و لەخۆدان و بابەڕۆ.. غەریبیش لەگەڵ تازیەبارەکان گریا و فرمێسکی باراند، بەدیار ماتەم گێڕانەوە وەستا هەتا تەرمەکەیان لە پیکابێک بارکرد و لە دەرگای نەخۆشخانە ئاودیوبوون، هەینێ غەریب بەچاوی بەفرمێسک و بە هەنسکەوە چووەوە لای دایکی و سەری بە سینگی کرد و بۆ سوبحیی جوانەمەرگ و بۆ بێکەسیی و بەدبەختیی خۆیی و دایکی لە هۆژنی گریانێیدا.

***

غەریب لە حەژمەتی جوانەمەرگبوونی ســـویحی کۆیی، بڕیاریدا کە لەمەودوا ســـەرتاپا جلی ڕەش بپۆشـــێت و وەک تازیەبارێک دەرکەوێ، زۆریش حەزی دەکرد لەمەودوا لەجیاتی غەریـــب مراوی بە غەریـــب ڕەشپۆش بانگی بکەن، بەگمیش وردە وردە شنگ و تاقەتی دەهاتەوەبەر، بەڵام جاریٚ وەک پێشانی لێنەهاتبۆوە و کەمێک بێهێز بوو.

عەســرێکی درەنگ غەریب بە ڕیشـێکی قەترانی و کراس و شـەڵواری ڕەش زۆر بەبیٚ خوڵقی لەبەر دەرگای حەســـاریٚ دانیشـــتبوو کەوتبووە داڵغان.. لە هیکڕا ئیســـۆ و ڕەمۆی خەلیفە ســـەعۆی وەک مووی ناو کونە کەپووی لەبەردەمی قیتبوونەوە، هەردووکیان لە تریان دەدا و فوول ســەرخۆش بوون، غەریبیش لەژوورەوە قسـوڕی نەکردبوو چارێگە جنێکی بەبیٚ ئاو هەڵقوڕاندبوو، هەر بە هاتنیانڕا دیاربوو هاتوونە تەشـــقەرە دەکەن و شـــەڕ دەفرۆشـــن، زۆر جاریدی بەدووان شـــەڕیان بە کوڕانی کۆڵان فرۆشتبوو لەشەڕەکەدا براوەبوونە.

ئیســـــۆ ملعنـدی لمووزی نزیککردەوە لە لمووزی غەریـب و دەلعـازیش گوتی:

_ ها مراوی ناشیرین.. ئەو ڕدێنە حیزە و ئەو شمەکە ڕەشە پیسە چییە لەبەرت کردییە؟

غەریب هەڵسایە سەر پێیان و بەهێوری گوتی:

+ ئیسۆ گەڕت لەگەڕم مەئاڵێنە، بڕۆن یێخەم بەردەن... بەسـەری داکم خراپتان بەســـەر دینم، ئەمن نە شـــاکری پلکە مەلا ژنێمە.. نە ئازادە زڕجوو.

ئیســـۆ پتر دەموچاوی لێبردە پێش و چاوی لەدووڕ چاوی غەریبی ناو گوتی:

_ قەشـــــمەر... ئەتو لەوان زڕجووتری، ئەگەر پیاوی و خۆت بە پیاو دادەنێی فەرموو دەست بکەوە.

هەر یەکسەر کەللەیێکی لەناو دەمولوتی غەریب داو خوێن فیچقەی کرد و بووە شەڕییان، غەریب مەردانە هاتە دەست و بەنۆرە جارێک لە ئیسۆی دەدا و وەک تەراح لە عـاردی دەگەوزانـد، ئینجـا پڕی دەدا ڕەمۆ و ئەویشـــــی دەشـــــێلا... بووە هەرا و دەوروجیران خڕبوونەوە، لەگەڵ دەنگە دەنـگ و هەرای خەڵکی، بەگمیش دەرپەڕییە دەرێ و خۆی گەیـانـدە مەیدانی شــەڕەکە، لەولاش هەواڵ گەیشـــتبووە فاتمی دایکی ئیســۆ و ڕەمۆ، ئەویش عەبا بەســـەرو وەک باشـــوکە هەر بە فڕین گەیشـــتە ناو ئاپۆڕەی خەڵکەکە، غەریب خوێن لە دەم و لوتی گیر نەدەبوو، ئیســـــۆ و ڕەمۆش گێژو وێژ لەناو خۆڵەپۆکی بەر دەرگای حەســـــارێ کەوتبوون و خوێن لەســـەرو گێلاکیان دەڕۆیی، ئینجا شـــەڕەکە بووە شـــەڕی بەگم و فاتمی خەلیفە ســـــەعۆی، دەســـــتیان لە تیتکی یەکتر ناو دەیانقیژاند و قسەی ناشرینیان بەیەکتر دەگوت.

فاتم بەهێزتر و بەگوڕتر بوو، بەگمی لە بنەخۆی ناو لەســـــەر ســـــینگی دانیشت و قیژاندی:

_ مراوییە سەگەکەت تەمبێ دەکەی باشە، دەنا چی خراپە پێت دەکەم.

بەگمیش کە تازە لەدوای نەشـــتەرگەرییەکەی هەڵســـابۆوە، بە نووزە نووز گوتی:

_ حەد و وجوودت چییە؟ لۆ چما شـــــار بێ حاکمە، وەڵڵاهی دەبی لە مەخفەری تەیراوەی لەکن معاون ســـــاڵحی شـــکایەتی لە هەردوو کوڕە شەقاوەکەت و لەخۆشت بکەم.

هەینیێ خەڵک کەوتنە نێوانیان و فاتم و بەگمیان لێککردنەوە و خەریکی خوێن ڕاگرتنی کەپووی غەریب و تیمارکردنی سەری ئیسۆ و ڕەمۆی بوون، تەنیا کەسێک دەیویست ئاگرەکە خۆش بکات و فیتنەکە گەورە بکات و نەهێڵێ هەردوو لا ئاشت ببنەوە، کابرای سمێڵ سبوغ عامی ڕەزاگران سەیدە فشە بوو، بە پستەپست هەر جارە و یەکێکیانی تیغ تیخە دەدا، سەید عەبدولقادر دەچووە تەرەفی فاتم و کوڕەکانی بە پستەپست پێیدەگوتن:

ـ ئەنگۆ کێتان پێدەرێن، بابتان خەلیفە سەعۆ بووە، گەورە و گچکەی ناو بازاڕی گەورە زەندەقیان لێچووبوو لەبەری دەلەرزین، کوو دەبی خوێڕییەکی ئەوها زەفەرتان پێ ببا؟

وەکیدی هەر بە گورگەلۆقە خۆی دەگەیاندە غەریبۆکە و لەبن گوێی دەخوێند:

ـ کوو دەبی ئەو خوێڕییانە کەپووی توو بشکێنن، ئەوانە بەرەڵلان و هەموو تەیراوە دەیانناسی، ئاخر ئەتو کوڕە شەهیدی... بابت لەبەر یەک ئۆردی عەسکەری عێراقی دانەدەهینا... ئەگەر پیاوبی نابی لەسەریان بچی و لێیان خۆشبی.

سەیدە فشە ئەمجارەش فیتنە و گۆبەندەکەی سەری نەگرت و بەگم زوو بەزوو بەئاگا هات و لەمەرەدی گەیشت و لێی هەڵادا:

ـ ئەرێ ئەتو لەکنە خوابی سەیدو لەخواترسی، عەیب ناکەی لە فیتنە و فەسادی دەگەڕێی.. ئینجا ڕووی لە فاتم و کوڕەکانی و خەڵکەکە کرد و گوتی:

ـ با لۆ هەموو لایەکی مەعلوم بی... ئەمن و غەریبی کوڕم هیچمان لەبەر دری نییە، دوو براش بەشەڕ دێن، دوو خوشکیش لەمارەکی دەبێتە

شـــەڕیان، بەران ئەمە گەردنی فاتم و کوڕەکانی ئازا دەکەین و هیچمان لەبەر دری نییە.. با کەس نان و پیازی بەو دەمەقارییەی مە نەخوا.

***

ئەو شـەڕەی دادە بەگم و فاتمی خەلیفە سـەعۆی لەسـەر منداڵەکانیان بەرپایان کرد، بۆ هەردووکیان بەخێر گەڕایەوە، لەو ڕۆژەوە ئەوەندە تەبا و حاڵ و سـاڵ بوون وەک دوو خوشـک بەبێ یەکتر هەڵیان نەدەکرد و نەدەحەوانەوە، زۆر جاران هەرکە فاتم دەچووە حەمامی سـیروان، گورج و گۆڵ بەگم سەروپشتی دەشووشت و پرچی بۆ دادەهێنا و پەشتەماڵی خت و خاوێنی بۆ ڕادەگرت.

بەم جۆرە، غەریبۆکەش بووە کوڕێک لە کوڕەکانی خەلیفە سـەعۆی، هەر جارێک ڕەمۆ و ئیسۆ لە بارەکان شەڕیان بکردبا و پۆلیس بیگرتبان، فاتم غەریبۆکەی بەگەر خۆی دەدا و عەریزەی کەفالەتی ئیسـۆی لەدەسـتە خۆی و هی ڕەمۆ و ئیبۆش لە باغەری شـەرواڵی غەریبی دەپەستا و مەخفەری پۆلیسـی خانەقا و تەیراوەیان دەکوتاوە، لە خانەقای دەبووە کەفیلی ئیسـۆ و بەرەڵایان دەکرد، لە تەیراوەش غەریبۆکە دەچووە لای مفەوەز تەهای قیرسـیچمە و دەبووە کەفیلی ئیبۆ و بەرەمۆشـی دەگوت:

ـ کاکێ بێخەمبە... سـبەی یان دووەی دێم و ئەتوش لەبن دەسـتی پۆلیسان قوتار دەکەم.

لەگەڕانەوەیان، فاتم بە غەریبی دەگوت:

ـ غەریبۆکە... چا نییە ئەتو ئەو بەزم و ڕەزمەت نییە و شەڕو گێچەران لۆ داکت نابەیەوە.

غەریب بە زەردەخەنەوە:

ـ پله فاتم... ڕاسته خەڵکی تەیراوەی بەمن دەرێن خۆڕی و سەرسەری و ئارەقخۆر، بەران بەسەری داکم بە حەیاتم پێم خۆشنییە پێ لە تەختەی چروک بنێم.

***

# ٥

## هاوینی ساڵێکی گەرمەی جەنگی (عێراق — ئێران)

(تەیراوە)

لوورە لووری ئینزاری فڕۆکە، لە ئەنتێنە زەبەلاحەکەی ناو گۆڕەپانی قوتابخانەی (زانین) ی سەرەتایی هەمووانی شڵەژاند، لوورە لور بەردەوام بوو خەڵکی سەرجادە و ناو کۆڵانیش هەر بابایە و بەشێوەیێک هەوڵیاندەدا هەبوو بە غارە غار خۆی لە ژێرزەمینی خانووەکان دەپەستا، هەندێک لەپەنا دیوار و چەند کەسێکیش هەر بەپێوە خۆیان لەپەنا و سایەیی دەرابەی دوکانەکان دەنا و سەیری بۆشایی ئاسمانیان دەکرد و لە چاوەڕوانی فڕۆکەدا تۆقیبوون.

لەم کاتەدا غەریب و سیرۆ و جەبارە قەڵەو لەسەری ئەو کۆڵانە ڕاوەستابوون کە بە جووت سایدی بەحرکە دەناسرێت و هەردوو ساید لێک دەبنەوە و بەرەو قەڵا و سینەما سیروان و حەمام شیفا، جادەکە هەوراز دەبتەوە بەرەو ماڵی خەلیفە سەعۆ و مزگەوتی بالیسانی لەوبەری و لەم بەرەش ماڵی قانیعەی ژنی ئیحسانی محەتەی، ماڵی دایزە نەسرەت و ماڵی پیرێژنە کۆرە و دوکانی مام حەمیدی تا دەگاتە قوتابخانەی (ئەیوبییە)ی سەرەتایی کچان.

ئەوان هەرسێکیان... غەریب و سیرۆ و جەبارە قەڵەو بەنیازبوون هەوراز بچن و پیاسەیێک لەدەورەی قەڵات و قەدەمێک بە بەردەم چایخانەی مەچکۆ و باتە و ناو قەیسەری لێدەن، ئا لەو کاتەدا بوو لەگەڵ لوورە لوورەکە و هاش و هوشی فڕۆکە جەنگییەکە غەریب بە پرتا و خۆی

بەسەر ئەو گۆمەتە خۆڵەی کە لە ڕۆخ جادەکە و بەرانبەر ماڵی مامۆستا ئەسعەد و ماڵی مام سەید هەڵدرابووەوە، کەوتە سەر سک و مات و بێدەنگ بوو، سیرۆ و جەباریش هەر بەپێوە لە پەنا دەرگای خانووە دوو نهۆمەکە خۆیان وێک هێناوە و بە حەپەساوی سەیری غەریبۆکەیان دەکرد.

لەگەڵ بیستنی هاش و هوشی فڕۆکەکە، دۆشکەکەی سەربانی قوتابخانە و ئەوەی سەر قەڵاتێی بەردەم دەرگای ئەحمەدیە کەوتنە تەقەکردن، قرم و هۆڕ لە هەموو لایەکەوە دەبیستراو ئاسمان بە درێژایی ڕێگای نێوان باخچەی کورد و عەرەب تا چوارڕییانی گازینۆ عەنتەر بووە یەکپارچە ئاگر، فڕۆکە ئێرانییەکەش بەرزتر لە حوکمی گوللەکانی دۆشکە و چەکەکانی تر ماندو و هیلاک پێداهات و تا لە کۆتایی بەلای شەقامی شەست مەتری چەند موشەکێکی لەو تانکییە ئاوە گرت کە لەناو ماڵان چەندین ساڵە قیت کراوەتەوە، موشەکەکان سەرییان کرد و وەبەر دوو خانووی لەتەیەک یێکی نزیک تانکی ئاوەکە کەوتن و گرمە و تەپ و تۆز و دووکەڵ و ئاگر بەری ئاسمانێی گرت، قرموهۆڕی دۆشکەکانیش هەر بەردەوام بوو و سەراو دووی فڕۆکە شەق و شڕەکەی دەناو نەیاندەپێکا.. پاش کەمێک فڕۆکە دەنگی نەما و بزر بوو، ئەمجارە ئینزاری ناو قوتابخانەی زانین بە لوورەی درێژخایەن موژدەی ڕەوینەوەی ترسی ڕاگەیاند، هەینێ خەڵکەکە وردە وردە لەپەناو پەسێوان بەدەرکەوتنەوە و لەهەمان کات دەنگی ویقە ویقی ترسناکی ترومبێلی فریاکەوتن و ئاگرکوژێنەوە بەرزبووەوە و بە تیژڕەووی بەرەو شوێنی بۆردومانەکە دەڕۆیشتن کە هیچ باسێک نەما، غەریب بە هەشتاوی قیت بووەوە و تۆز و خۆڵی لە کراس و شەرواڵە ڕەشەکەی تەکاند، جەبار

و ســـــیرۆش بە گـاڵتە و تیزەوە هـاتنەوە ڕۆخ جـادە و بە غەریبۆکەی پێدەکەنین و قەشمەریان پێدەکرد.
غەریبیش ئیمانی لە کەللەی نەمابوو، بە تووڕەییەوە پرسی:
+ ئەوە بە چ پێدەکەنن هەی قەشمەرینە؟
سیرۆ بەپێکەنینەوە:
_ وەڵڵا بەتوو.
+ لۆ بەمن پێدەکەنن هەی خوشک حیزینە؟
جەبارە قەڵەو هەر بە قەشمەری پشت ملی خوراند و گوتی:
_ ئاخر ئەتو خۆت نەدیت، ئەمە چاومان لێبوو و دیتمان کو خۆت بەو گۆمەتە خۆرەی دادا و چتۆ تەپ و تۆزت هەستاند !!
غەریب هەر بە تووڕەیی باگۆی دانەوە:
_ ئاخر تەیارە گەمەی نازانی و سـارۆخەکانی هی سـوعبەتان نین، ئەو سـایەق تەیارە خوشـک حیزە ئەگەر پیاوە با بێتە خوارێ و تەن بە تەن شەڕە چەقوی بکەین، بەسەری داکم دەبی هەلا هەلای بکەم... ئەنگۆش لەوەندەی زیاتر گووی مەخۆن و پێشم کەون با بڕۆین.
بەرەو بازاڕ و قەڵا و مەچکۆ هەنگاوەکانیان گورج کردەوە.
لە بینـایەی مەحکەمە ڕەت بوون و خۆیـان لەژێر قەڵا دیتەوە.. ئەوان هێشـــتا ترس و دڵەڕاوکێی بۆردوومانەکە بەرینەدابوون، هەوراز بوونەوە بەرەو قەیســەری، هەر سـێکیشـیان فیراری سـەربازی و موتەخەلیفی عەسـکەرین، لە سـێگۆشـەی باتا دوو ئینزیباتی عەسـکەری بانگی هەرسـێکیان کردن و داوای ناسـنامەیان لێکردن، هیچیان پێ نەبوو، لەو کاتەی قۆڵبەستیان کردن و بەتەمابوون سواری زیلی عەسکەریان بکەن،

جەبارە قەڵەو بەهەڵەداوان ئاوڕی لە ئینزیباتە ڕەشــە کەڵەگەڵەتە دایەوە و پێی گوت:

_عینی... ثانی ئیبن عەم کاکە موئمن... ئینزبات ویاکم.

هەرکە ســەرەگەورەکەی ئینزیباتان ئەمەی بیســت، یەکســەر فەرمانی بەڕەڵاکردنی دان و وازیان لێهێنان، هەرســێکیان... غەریب و ســیرۆ و جەبارە قەڵەو هەر بەغار بەرەو تەیراوە بوونەوە و لەیەک شوێن ڕانەوەستان و ئاوڕیان نەدایەوە.

***

عەیامێک بوو، سـیرۆ ئێواران بزر دەبوو، بە ناچاری غەریب و جەبارە قەڵەو دوویەدوو دادەنیشتن و سەریان گەرم دەکرد، غەریب بە چارێگێک و سێ پارچە لوقمەکە تەواو تێر دەبوو کێشەی نەبوو، بەڵام جەبارە قەڵەو دەیگەیاندە نیو قاپ و هەر لە ئێوارەش دوو پارووی کەبابی چەوری لەکن مام وسو کەبابچی دەپێچاوە و زوو بەزوو تێدەتراند.

غەریب دڵی لە سیرۆ کرمێ بوو بوو و مەراقی بوو بزانی ئێواران کە بز دەبی کێوە دەچی؟ هەر بۆیە زوو بەزوو لە دەرفەتێکدا لە سیرۆی پرسی:

_ کوڕە هەی کەری کەرباب درۆم لەگەر نەکەی... عەیامەکە هێواران بزر دەبی... کێوە دەچی؟

سـیرۆ بە قۆڵی کورتەکی، دەسـتەکی بە لووتیدا هێنا و پاکی کردەوە ئینجا گوتی:

_ کاکە هەندەک هێواران ئەگەر حەفلە لە قاعەی شـەعب هەبی زوو بەزوو نیو قاپی لێدەدەم و دەچمە ئەوێ ، حەفلەکان خۆشـن، ئەوە تاهیر تۆفیق، ئەوە فوئاد ئەحمەد و تەحسـین تەها، ئەوە قادر زیرەک و سـابیر کوردسـتانی و جەلال سـەعید، هەر جارەو بەنۆرە یەکێکیان پەیدا دەبی و گۆرانیان دەرێن، جارە جارەش بارەکی خۆشـی لە خوارێ لە کن گازینۆ عەنتەری کرایتەوە، بارِ سـەنابل دەچمە وێ، مەشـروب و مەزەکەی زۆر هەرزانە و جێیەکەشی گەلەک فێنک و خۆشە.

غەریب لەلای بووە مەراق، هەردوو شوێنەکەی لێبووە مەراق — بارِ سەنابل و قاعەی شـەعب، شـەوێکیان دانتری گەڕایەوە حەسارێ... خەڵکەکە و بەگمی دایکیشـی هەموو بەدیار تەلەفزیۆنی کەرکووک دانیشـتبوون سـەریری چیرۆکی تەمسـیلی چلپاویان دەکرد، غەریب لاگنەی لێوە دەهات بەحاڵ شـەقاوی بۆ دەهاوێشـترا، بە نوزمیەک سـڵاوی کورد و

خۆی گەیاندە ژوورەکەی خۆیان لەسەر دەم کەوتوو، خەو بردیەوە... خەو و خەونی یەکاو یەک بوو، لە خەونیدا:
[ هۆڵی گەل پڕ بوو لە خەڵک، هەموو لە چاوەڕوانی ئەوە دابوون ئاهەنگ دەستپێبکات، دیار بوو غەریب لەم ئاهەنگەدا موهیم بوو، ئاخر وا خۆی لەناو قاتێکی نیلی ئەفەندییانە و بۆینباغی پەپوولە و قۆندەرەی ڕەشی بە بریقەی لمووز درێژ بینیەوە، هەموو سەیری ئەو دەکەن، وەک ئەوەی کلیلی ئاهەنگ و دەستپێک لەلای ئەو بێت، خۆی خڕو قیت کردەوە و دەستێکی بەسەر و پرچ و ڕیشە ڕەشە قەترانییەکەیدا هێنا و شەقاوی بۆ سەر شانۆ هاوێشت، تیشکی ڕووناکی بە تەنیا و تەنیا لەسەر ئەو بوو، مایکیان بۆ ڕاگرت و وەریگرت و تەپە تەپێکی لێوە هێنا و یەک دوو جاران گوتی: ئەلوو... ئەلوو...
دەنگ دەگەڕایەوە... واتە مایک ئیش دەکات و بێ کێشەیە... جارێکی تر بە ئاسکی کۆخەی بۆ کردەوە، مایکی بەدەستە ڕاستییەوە بۆ دەمی برد... لەم کاتەدا لەناو هۆڵ و لەناو ئاپۆڕەی جەماوەرەکە بووە غەڵبەغەڵب و فیکە و هەروا و حریت و هۆڕ.. غەریب هیچ خۆی تێک نەدا... خۆی قیت کردەوە و چاوی نوقاند و گوتی:
_ میوانە بەڕێزەکان.
جارێکی تر لەناو هۆڵ بووەوە هەراو فیکە و چەپڵە و جڕت لێدان و دەنگێک بەئاشکرا هاواری دەکرد:
_ مراوی... مراوی
غەریب هیچ خۆی تێک نەدا و وای نیشاندا کە هەر وشەی مراوی نەبیستووە لەسەر وتەکانی بەردەوام بوو:

ـ بەڕێزان... خۆشـحاڵین لەم ئێوارە ڕەنگـاڵەییەدا، ئێمە و ئێوە و هونەرمەندان...

جارێکی تر فیکە و جڕت و چەپڵە و قاقای پێکەنین بەرزبووەوە، ئەمجارە هۆڵەکە یەکپارچە هاواریان دەکرد:

ـ مراوی... مراوی .... مراوی.

غەریب، ورەی بەهێز بوو، بە نەرمە کۆکەیەک کەوتەوە قسە:

ـ ئامادەبووان، لە دەستپێکی ئاهەنگەکەماندا فەرموون ئێوە و .....

چەپڵە و جڕت و هۆیها و حریت و هۆڕ تێکەڵ بە:

ـ مراوی.... مراوی.... مراوی

بووە و کەڵکی هیچ قسـەیەکی تر نەما، لەم کاتەدا، برادەرانی ڕاوند ( ئەو چاڵەی لەبەردەم شـانۆیە و کادیرە هونەریەکانی دەنگ و ڕووناکی لێدادەنیشن) وردە وردە وایەری مایکەکەی دەست غەریبیان بۆ لای خۆی ڕاکێشا، غەریبیش هێور هێور بۆیان دەنووشتاوە و دەیویست قسان بکات و یەکەمین گۆرانیبێژی ئاهەنگەکە پێشـکەش بکات .... ئەوان وایەریان ڕادەکێشـا و غەریب مایکی دەسـتی توند دەکرد و بە هێواشـیش بۆ لای ئەوان دەنووشتایەوە... وایەریان ڕادەکێشا و مایک لە دەستی غەریب توند و توندتر دەبوو، غەریبیش بە شێنەیی هەنگاوی بۆ بەردەم شانۆ و بۆ لای ڕاوند دەهاویشـت و زیاتر دەنووشـتایەوە تا دواجار هیچ دەرفەتێک بۆ غەریب نەما و وایەرەکەیان توند توند ڕادەکێشـا... لەناکاو غەریب ڕووی مایکەکەی لەوان کرد و هاواری کرد:

ـ ها لە قوزی داکتانی بنێن.

ئیـدی لەخوارەوە و لەنـاو هۆڵ دەنـگ و هـاواری : مراوی ... مراوی بەسـەر هەموو دەنگەکانیدی زاڵبوو]. لە پڕ غەریب لەناو ئاو و ئارەقێکی

زۆر لەخەو ڕاپەڕی و سەیری دەورووبەری خۆی کرد، هەرکە لەمەسەلەکە گەیشت، هەناسەیێکی هەڵکێشاو گوتی:
ـ زۆر شوکر خوایە... چا بوو خەون بوو

***

عەسری ڕۆژی پاشتر، غەریب قسەکەی سیرۆی ببیرهاتەوە که بارێک لەنزیک فلکەی گازینۆی عەنتەر هەیە، یەکسەر بڕیاریدا سەرێک لە بارەکە بدات تا بزانێ سیرۆ ڕاست دەکات یان دەلەسەیە.. دەستی لەگیرفانی ڕاکرد دڵنیابوو کە پارەی تەواو پێیە و کێشەی نییە، ئیدی هەر بەڕێوە چارێکە جنەکەی لەگەڵ لوقمە بەلەزەتەکەی تەواوکرد و خۆی لەبەر دەرگای بارەکە بینیەوە، ئینجا بە قاڵدرمان هەڵگەڕاو چووە سەرەوە، دەرگای بارەکەی کردەوە، دەنگی مۆسیقایەکی هێمن و کز بەرگوێی کەوت، بارەکە زۆر ڕووناک نەبوو چەند گڵۆپێکی ڕەنگاو ڕەنگ کزکز ڕووناکییان دەبەخشی... خەڵک سێ سێ و چوار چوار لەسەر مێزەکان خڕببوونەوە و خەریکی خواردنەوە و گفتوگۆبوون، کەشێکی هێمن و بێدەنگ سەرتاپای بارەکەی گرتبۆوە، لە بنەبانێ تەلەفزیۆنێکی شاشە گەورە ئیشی دەکرد، بەڵام هیچ دەنگێکی لێوە نەدەهات، غەریب هەواێکی خۆشی وەرگرتبوو هێدی هێدی هەنگاوی ناو چووە پێشەوە و چاوی بۆ مێزێکی بەتاڵ دەگێڕا تا بچێت و دابنیشێت.

دوور بە دووری مێزێکی بەتاڵی ڕەچاوکرد و چووە پێشێ، لە تەنیشت مێزەکە، ژمارەیێک گەنج لە دەوری مێزێک گردببوونەوە و دەیانخواردەوە و گفتوگۆیان دەکرد، هەرکە غەریب دانیشت و سەیرێکی گەنجەکانی کرد، دووانیانی ناسیەوە، ئەوانیش هی تەیراوەینە و ئەڕبابن، دەنگی گەنجەکان بە تەواوی دەگەیشتە بەر گوێی غەریب دەمێکی خۆش ئەوها دانیشت و کەسێک نەهات، بڵێ: کەرت بەچەندی، خەریک بوو دەنگ هەڵبڕێ، بینی لەسەر مێزی تەیراوەییەکان، گەنجێکیان بە بەرداخ تەپە تەپی لە مێزەکەیاندا هێنا و گورج وگۆڵ کابرایێکی کراس سپی و پانتۆڵ ڕەش، کە بۆینباغێکی پەپوولەی ڕەشی لە مل جەڕباندبو، هات

و بەرپێزەوە گوێی لە داواکاری گەنجەکان گرت و لە پارچە کاغەزێک نووسـی و ئەوێی بەجێهێشـت، غەریب هەناسـەیێکی قووڵی هەڵکێشا و لەدڵی خۆی گوتی: ئەو بەزمە خۆشـە، ئیدی ئەویش بە بەرداخەکەی بەردەمی تەقەی لە مێزەکەی هێنا و یەکێک گورج لەبەردەمی قیت بووەوە، بەرپێزەوە گوتی:

+ ئەمرکە... چی دەفەرمووی؟

غەریب:

_ چارێگەک جنم دەویَ؟

بۆیەکە:

+ مەزەکەت چ بی... چت حەز لێیە؟

غەریب:

_ مەزەی من لەکنەنگۆ بەدەست ناکەوی.

دەستی لە باغەری گیرفانیراکرد و سێ لوقمی سووری دەرهێنا و لەسەر مێزی دانا و ئینجا بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

_ ئەوە مەزەی منە.

بۆیەکە سـەری بۆ نەوی کرد و شـتێکی لە کاغەزەکەی ناو دەسـتی نووسی و ڕۆیشت.

لە مێزەکەی تەنیشتی قسەوباس گەرم بوو، غەریبیش بە ئاشکرا هەموو قسەکانی دەبیست، گەنجێکیان گوتی:

+ ئەمن پێمباشـە لەمەودوا زیاتر گرنگی بە کۆبوونەوە دوو قۆڵییەکان بدەین و زۆر بە نهێنی چالاکی و ئەرکەکانمان ئەنجام بدەین، با کەس لە نهێنییەکانمان نەگات.

گەنجێکی تر هەڵیدایێ: غەریبیش بەبێ ئەوەی حەز بکات گوێی لێیە.

+ وەڵڵاهی ڕاســـت دەکەی، دیوار بەگێیە.. دوژمن لە هەموو جییەکی جاسووس و چاوی هەیە با بەهەوەنتە تووشی گیران و قوڕبەسەری نەبین.
لەم کاتەدا بۆیەکان هاتنەوە، داواکاری گەنجەکانیان خســـتە ســـەر مێزەکەیان، بۆیەکەی غەریبیش گەیشت و چارەگەک جن و دۆلکەیەک ئاو و سەهۆڵ و چەتاڵ و کەوچکی بۆ لەسەر مێزەکە دانا و پاشەو پاش گەڕایەوە.
غەریب، بە پەلە و بێ دواکەوتن پێکێکی خەســت و خۆڵی ســازکرد و چاوەڕێی بوو تا نەختێک سارد بێت.
لە مێزەکەی تەکی، جارێکیدی دەنگ بەرز بووەوە، یەکێکیان گوتی:
+ وەڵڵاهی جەماعەت چەند تاگامان لەخۆمان بی هێشـــتا کەمە ( ئاوڕێکی بەلای غەریب دایەوە و بەردەوام بوو) ئەها تەماشای ئەو جلک ڕەش و ڕدێن ڕەشـــەی بکەن، کێ دەرێ ئەوە ئەمنەکی تـازە نییە و دایەرەی ئەمن لۆ تاقیباتی مە نەیان ناردییە؟
یەکێکیدی، کەمێک زمانیشی گران بوو بوو، هەڵیدایێ:
+ وەڵڵاهی ڕاســت دەکەی... ئەمن ئەو شــکولاتەم لێرە قەت نەدیتییە، ئەوە یەکەمجارە دەیبینم.
برادەرێکیان، بە ترس و چرپە گوتی:
_ کوڕە کاکە ناوی خوای بینن، ئەمن ئەوەی دەناســـم.. ئەوە (غەریب مراوی)ی تەیراوەیە، کوڕە شـــەهیدە...بیســـت و چار ســـەعاتی خوای سەرخۆشە.. ئەمنی چ و حاری چ؟
لەم کاتەدا غەریب پێکەکەی هەڵگرت و ڕووە و ئەوان بەرزی کردەوە و بە دەنگێکی دلێر کە هەموویان گوێیان لێ بوو گوتی:
+ چەریۆ.... بە سحەتتان.

ئیدی پێکەکەی هەموو هەڵقوڕاند و قەمپاڵێکی بە لەزەتیشی لە ڕەحەتە لوقمە سوورەکەدا و کەوتە مرچە مرچ و زەردەخەنە بەخشینەوە.
بارەکە وردە وردە قەرەباڵغ دەبوو، یەکێک لە مێزەکانی ژێر تەلەفزیۆنەکە سێ ئەفەندی قات ڕەشی سمێڵ گەورەی لەسەر بوو جیا لە خەڵکەکانیدی زیاتر داوای خواردنەوە و مەزە و تەرتیباتیان دەکرد و هەمو بۆیەکانیش هەلەکەسەمایان بوو، تا باشترین خزمەتیان بکەن.
غەریب، پێکی دووەمی دروستکرد و برادەرانیش لەسەر مقۆمقۆکانیان گەرمتر بوون، بیرەی فەریدەیان دەخواردەوە و بە کەوچکان نۆکاویان فڕ دەکرد و قسەی گەورە گەورەیان دەکرد، سەرتاپای مێزەکانیدی پڕ بووبوون و چرە دووکەڵی جگەرە ئەم ناوەی تەنیبوو، وردە وردە دەنگە دەنگ و هەرا و زەنا زیاتر دەبوو، غەریب لەسەرخۆتر مەسەی لە پێکەکەی دەدا و گازی لە لوقمەکەی دەگرت، مێزی گەنجەکانیش کەشوهەواییێکی تری گرتبۆوە و لە دەرفەتێکدا، یەکێکیان داوای لە برادەرەکەی تەنیشتی کرد و گوتی:
+ دەی دڵدار گیان وەختیتی، زۆر غەریبی مامە سامی عەودالی دەکەم.
دڵدار گەنجیکی قۆزی زیت و ژیکەڵە، قومێکی لە بیرەکەی دەستی دا و گوتی: وەی بەسەرچاو.
ئیدی بە دەنگێک کە خۆیان و غەریب و یەک دوو دانیشتووی مێزەکانیدیش گوێیان لێبوو، دڵدار تێیهەڵکرد:

قەلبی من گەر چەشنی لالە بێتو نەوتی تێ بکەن
ئاگری دوژمن بێتە گیانم وەک چرا من پێ بکەن
شەقشەقی کەن گۆشت و ئێسقان یەک بە یەک خوێی تێبکەن

بێ ترس من دێمە مەیدان حوکمە ئازادیم دەوێ
گەر نەسووتێم و نەخنکێم چۆن هەژارم سەرکەوێ
ئیدی بووبە چەپڵەلێدان و ئافەرین و ئەڵڵاهـ و ئەڵڵاهـ

غەریبیش ئەوە یەکەمینجارە لە شوێنی وا خۆی دەبینێتەوە، مگێڕی زۆر ساز بوو، تەواو سەرخۆش و دانتری بووبوو بەحاڵ پێڵوی چاوەکانی بۆ هەڵدەهات و سەیری ئەو مەخلوقاتەی ناو بارِی دەکرد... بە شێنەیی پێکێکی تازەی سازدا، مێزی گەنجەکان لەسەر گۆرانی و بەزمە خۆشەکەی خۆیان بەردەوام بوون، لەو سەرەوەش ئەفەندییە سمێڵ فشەکان بە گۆرانی دڵدار و گەنجەکان سەغڵەت و هەراسان بوون، هەر زوو بە زوویی داوایان لە بۆییێک کرد کە دەنگی تەلەفزیۆنەکە بەرزکاتەوە کە لەم کاتەدا یەکێک لە سروودەکانی قادسیەی سەدام بوو، دەنگی سروودەکە بەسەر هەموو دەنگەکانیدی ناو بارەکەدا زاڵ بوو، بێدەنگی سەر مێزەکان بە تەواوی هەست پێدەکرا، لەم کاتەدا یەکێک لە قات ڕەشەکان هەڵسایەوە و بەشێوەی چۆپی عەرەبان کەوتە هەڵەکە سەما و دەست ڕاوەشاندن، مێزی گەنجەکانی تەیراوەی تەواو کرِ و بێدەنگ بوون، غەریب دوا چۆڕی لەدوا پێکی بەردەست بڕی و لوقمێکی بە مڵچە مڵچ ئاودیوکرد، چاوی هیچی نەدەبینی .... لە هیکرِا هەڵسایەوە سەرپێ و بە شەقاوی نارِێک و پێچاو پێچ هەنگاوی هەڵهێنا، سەرەتا گەیشتە ڕاستی مێزی گەنجەکان و زەردەخەنەییێکی بۆ کردن و بە ئاشکرا ماچێکی بۆ هەموویان هەڵدا و ئەوانیش هەرکەسەو لەلای خۆیەوە ماچێکی بۆ هەڵدایەوە، لەوێ ڕەت بوو بەلاکە لاک خۆی گەیاندە نزیک تەلەفزیۆنەکە و مێزی سمێڵ فشەکان ... بە حاڵ چاوی دەدیت، بینی یەکێک لە سمێڵ فشە قات ڕەشەکان هەڵسایە و دەستی بەرزکردۆتەوە و

هوتـاف لێـدەدات .... بەڵام غەریـب گوێی لە دەنگی نـابێـت و هیچ نابیستێت، جگە لە دەنگە زۆر بڵندەکەی تەلەفزیۆن ... لە جێگەی خۆی چەقی و سـەری کاسـی بە هەر چوار دەوری خۆیدا هەڵدەسـوڕاند مینا پڵنگێکی زامدار... بە ئاسـتەم تارمایی حەشـاماتەکەی دەبینی، لە پڕ بانگی یەکێک لە بۆیەکانی کرد کە لێیەوە نزیک بوو، تێیگەیاند کە دەنگی تەلەفزیۆنەکە نزم بکـات، بۆیەکە چوو دەنگی تەلەفزیۆنەکەی نەهێشت، بار کشومات و ترسناک و هەموو لەچاوەڕوانیدا بوون، غەریب کورسـییێکی ڕاکێشـا و چووە سـەری و سـینگی خۆی دەرپەڕاند و بەتەواوی بەسەر جووڵەیدا زاڵ بوو بە زمانێکی قوڕس هەڵیدایێ:

_ جەماعەت ئەمن هەمووتانم خۆشدەوێ، ئیحترامم وەکی خۆرێ و ڕێزم وەکی کای لۆتان هەیە.

ناو بارِ هەندێک دەنگی تێکەوت، هەبوون پێدەکەنین، جەماعەتێک دەیانپرسـی ئەوە چ دەڵێ، ئەوانیدیش کردیانە چەپڵە لێدان، غەریب خراپتر هەڵچوو بەدەست ئاماژەی بێدەنگی بۆ خەڵکەکە کرد و تێهەڵچووەوە:

_ برادەران ڕاسـتـە ئەمن کوڕە شـەهیدم بابم خۆی بە قوربانی ئەو مەملەکەتەی کرد، بەس بەخوای ئەو پـارەیەم پێ نییە بتـانم هەمووتـان دەعوەت بکەم.

یەکێک لە سمێڵ فشەکان لێیهەڵسایەوە و چووە نێزیکی و لێی پرسی:

+ کوڕە شەهیدی؟ بابت کەینێ شەهید بووە؟

غەریب حەماسی زیاتر بوو، یەخەی کراسە ڕەشەکەی گرت و دایدڕاند و هاواری کرد:

ـ بابی من لەمێژە شەهید بووە، ئەگەر غەڵەت نەبم ساڵی ١٩٦٣ لەسەر چیای پیرە سەفینی خۆشناوان، ئەمن لە زکی داکم بوومە بابم شەهید بووە.

سمێڵ فش زیاتر دەماری گرت و لێیڕاخوڕی:

ـ وسکتبە... بابی توو شەهید نییە، شەهید بەس ئەو پیاوانەن کە لە قادسیەی سەدام شەهیدبوون و دەبن، ئەوانە شەهیدی ڕاستەقینەن.

غەریب بە تەواوی دەماری گیراو نەڕاندی:

+ جەماعەت ئەمن داوای لێبووردنتان لێدەکەم بەسەری داکم ئەوەندە پارەم پێنییە دەنا هەمووتانم دەعوەت دەکرد، بەس موشکیلە نییە هەنووکەش هەمووتان بەمنیشەوە دەعوەتی ئەبوشوارێبین ( بەدەستیش ئاماژەی بۆ وێنەیێکی گەورەی سەدام حوسێن کرد )

ئەمنەکان شێت و هار بوون، هەڵسانەوە و هێرشیان بۆ غەریب هێنا، لەناو باڕی سەنابل بووە غەڵبەغەڵب و هەراو هۆریا، یەکێک لە ئەمنەکان ئامێرێکی لە تەنکێشی دەرهێنا و بە توتە توت کەوتە قسەکردن، خەڵکەکەش هەندێکیان لە ترسان و بەدزی شۆڕبوونەوە خوارێ و خۆیان دەربازکرد و هەندێکیشیان لەسەر مێزەکانیان چەسپابوون و هیچ جووڵەیەکیان نەدەکرد، کابرای ئامێر بەدەست لە قسەکانی بووەوە و بە هەڕەشەوە لە غەریب چووە پێشێ و نەڕاندی:

ـ قەشمەر قسەی بە سەیدولرەئیس دەرێی؟ سەبرکە ئێستا کوو خۆت لە کونە ڕەشێ دەبینییەوە، جارەکیدی بە حەیاتت ڕووناکی نابینییەوە.

غەریب پڵنگ ئاسا لە جێی خۆی چەقی و پتر هاواری کرد:

ـ هەی تڕحێو.. ئەتو بەسجن ئەمن دەترسێنی، ئەمن بەخۆم لە سجن لەدایکبوومە، بە سجن مەمترسێنە و ئەمن لە سجن ناترسێم.

لەناکاو ژمارەیێک چەکدار بە جلکی مەدەنی هاتنە سـەرەوە بۆ ناو بارەکە و غەریبی فوول سـەرخۆشـیان قۆڵبەسـەتکرد و بردیانە خوارێ و هاوڕشتیانە کورسی دواوەی نیسان پەترۆڵێکی سپی، دوو ئەمنی زەبەلاح لە ڕاسـت و چەپی سـەرکەوتن و پاڵیان بەسـەری غەریبۆکەی نا بۆ ناو کۆشـی، ترومبێلەکە تێیتەقـانـد بەرەو دایەرەی ئەمنی هەولێر.

***

لە ڕێگا تا گەیشـــتنە ناو گەراجی دایەرە، هەردوو ئەمنەکە ئەوەندەیان چەپەڵۆک لە پشتە ملی غەریبدا شێت و هار بوون و دەیانگوت:
_ گەوادی کوڕی گەوادی... ئەتـو چ گـووخـۆرەکـی قسـه بە سەیدولڕەئیسی برێی؟
لەگەڵ ڕاگرتنی ترومبێلەکە لەنـاو گەراج، ئەوان خەریکی دابەزانـدنی بوون، غەریـب هێڵنجی هـاتێ و ئەوەی ئەمشـــەوە خواردبووی هەموو هێنایەوە و ناو ترومبێل و پێش کۆشـــی خۆی لە ڕشـــانەوەیێکی بۆن بۆگەنی وەردا، ئەمنەکان هەر بەتەواوی شـــێت و هار بوون و غەریبیان دابەزاند و بە شەق و زللە و شاپ و قامچی ڕاپێچی ژوورەوەیان کرد.
ژوورەوە، بریتی بوو لە ڕاڕەوێکی کەمێـک بەرین و دووروودرێژ، هەرکە گەیشتن دەنگی لێدان و ئەشکەنجە و هات و هاواری زیندانیان ئەو ناوەی تەنی بوو، لە چەند لاوە هەردوو جەلادێک زینـدانێکیـان بەگیر هێنـابوو لێیان دەدا و جنێویان پێدەدا، غەریب واقی وڕمابوو، لەلایەک بەتەواوی خۆی لەسەر پێیەکانی پێڕانەدەگیرا و لاکەی لێوە دەهات، لەلایێکی دیش بۆنی ڕشـــانەوە نەوەک خۆی هەردوو جەلادەکەشـــی هەراســـان کردبوو، جەلادێکیان بردیە بن دیوارێک و ڕووی لە دیوارەکە کرد و گوتی:
+ لا تحرک گواد.
ئیدی هەر ئەوەندە بوو بەجێیان هێشـــتوو لێیدوورکەوتنەوە، بە مەزندەی خۆی نیو کـاتژمێرێک بەم جۆرە مـایەوە، لەم مـاوەیەدا هـات و هـاواری زیندانیان و زرچەی کێبڵ و لێدانی ســـۆندە هێندەیدی زەندەقی غەریبیان برد، یەکێـک دەگریـا، ئەویـدی دەپاڕایەوە و دەیگوت:وەڵڵاهی ئـاگـام لە هیچ نییە بوختـانم پێدەکەن، یەکێـک دوای فەلاقە بەزۆری وایـان لێ دەکرد ڕابکات و لەسەر پێیەکانی نەوەستێت.

غەریبیش هەناسەی لەخۆی بڕیبوو و ڕوو لە دیوار یەک جووڵەی نەدەکرد، تا لەناکاو دەنگی تەقە تەق و پێی جەلادەکان نزیک بوونەوە، دەنگێکی قەبە و گڕ لێی پرسی:

_ ها قەشمەر ناوت چییە؟

+ غەریب ... ناوم غەریبە.

دەنگە قەبە و گڕەکە:

_ فیعلەن غەریبی ... بە جلکە ڕەشەکەت و ڕیشە حیزەکەت ڕا دیارە غەریبی... پێم بڵێ چ گەوادێک فێری کردی قسە بە سەیدلڕەئیس برێی؟

_ بەسەری داکم نەمزانی سەرخۆشبووم، ئەمن چ حەدم هەیە قسە بە ڕەئیسی برێم... گووم خوارد.

+ فیعلەن گووت خوارد... برۆ ئەوشۆ پاڵدەوە... سبەینێ فێرت دەکەم لەمەودوا کوو گووی بخۆی.

فەرمانی دەرکرد کە بیبەن، هەردوو جەلاد قۆڵیانگرت و بەڕاکێش ڕاکێش بردیان، پاش هەندێک ڕۆیشتن، دەرگایێکی گەورە کرایەوە، بردیانە ئەودیو دەرگا، لەوێ لەلای دەرگایێکی بچووک ڕایانگرت.. گیرفانەکانی گەڕان... پارچە لووقمێکی سووریان لە گیرفانی دەستە چەپی شەرواڵەکەیان دەرهێنا، گیرفانەکەی تریشی برێک پارەی تیا بوو.. ئیدی دەرگا بچووکەکەیان کردەوە و پاڵێکیان پێوەنا بۆ ژوورەوە و دەرگایان لەسەر داخستەوە.

***

ئەوشـــەوە، هەرکە بە پاڵێک ڕەوانەی ژوورەوەیان کردو دەرگایان لەســـەر کڵۆمدا، غەریب جگە لەوەی جارێ هەر ســـــەرخۆش بوو، زۆر بێهێز و هیلاک بوو، سەیرێکی ژوورەکەی کرد زۆر بچووک بوو، لە بنمیچەکەوە گڵۆپێکی کز ڕووناکییێکی کزتری پەخش دەکرد، خۆ ئەمانەی هەر بە حاڵ بینی، ئیتر هیلاک و کاس و گێژ لە جێگەی خۆی دانیشـــــت و قاچەکانی لێ ڕاکێشـــا، هەســـتی کرد بەقەد باڵا و جەســـتەی خۆی ژوورەکە دروســـتکراوە، ســـەری خســـتە ســـەر باڵێکی و لەســـەر تەنیشـت لێیکەوت، جگە لە بۆنە گەنیوەکەی ڕشانەوەکە، بۆنی میز و پیسـایی و خوێن هورژمیان بۆ لووت و مێشـــکی هێنا، بەڵام خەوەکەی بەهێزتر بوو و چووە خەوێکی قووڵ .



بەگم ئێوارە تا درەنگانی شەو لە نەگەڕانەوەی غەریبی کوڕی کەمێک سەغڵەت بوو، دواتر ناچار پاش دەیان جار چوونە بەر دەرگای حەساریێ و گەڕانەوەی بۆ ژوورەکەیان، تەواو هیلاک بوو، چوو لەسەر جێگەکەی پاڵیدایەوە و لە دڵی خۆ گوتی: ئێ کوڕم لۆ ئەوهام لێدەکەی، چ خێرەکی خوای بوو، ڕۆژ هەتا هێواریێ وەکی سەی پێسووتا لە کۆرانانی، ئێ شەوەکەی وەرەوە کاولەکەت و لۆ تۆپینێ وەرەوە، داخوە هەنوکە لەسەر چ زبردانەکی کەتییە و سەرخۆشە، ئاگای لە دری من نییە چ ئاگرەکی گرتییە، لەگەڵ ئەم قسانە خەو بردییەوە و ئاگای لە دونیایێ نەما، بۆ بەیانی زوو بە زوو لە ماڵێ دەرپەڕی و سەرتاسەری جادەی تەیراوە و پێش دوکان و جێگە لابەلایەکانی بەسەرکردەوە، دواتر چووە ماڵی سیرۆ و جەبارە قەڵەوی... لەلای ئەوانیش هیچ سەرەداوێکی بەدەست نەکەوت، گەڕایەوە و هەوراز بۆوە بۆ لای ماڵی خەلیفە سەعۆی ... چووە لای سینەما سیروان و سوڕایەوە پێش گازینۆی شەوانی هەولێر و بە بەردەم کتێبخانەی گشتی شۆڕبۆوە، لەهەموو ئەوانەی پرسی کە دەکرێ سۆراغێکی غەریبی دەستکەوێ... هەر هەموویان یەک وەڵامیان دایەوە:

ـ برۆ... پیرێژن برۆوە حەساریێ... خۆت بە غەریب مراوی ماندی مەکە، داخوە لە چ ئاقارەکی بەسەرخۆشی کەتییە، هە بزانە وەکی مووی ناو کونە کەپووت لە پێش چاوت قیت بۆوە.

***

بۆ سبەینەکەی، غەریب لەگەڵ شرقەی کردنەوەی پەنجەرە گچکەکەی سەر دەرگا بە ئاگا هات، دەستێک بە قاپێکی پەل و سەموونێکی ڕەق هاتە ژوورەوە لە مۆلەق وەستا، غەریب هەر سەیری دەست و قاپەکە و سەموونەکەی سەری دەکرد و لە جێگەی خۆی نەجوولا... پاش کەمێک دەنگێک لەودیو دەرگاکەوە هاواریکرد:

_ ها حەیوان، گوەکەت وەرگرە.

ئینجا غەریب یەکپێ هەڵسا بە سەرسووڕانەوە خۆی گەیاندە لای دەرگا و قاپ و سەموونەکەی وەرگرت... دەستەکە بە هەشتاوی کشایەوە و شرق پەنجەرەکە داخرایەوە.

غەریب سەری دەسووڕا و گێژ بوو، بە حاڵ خۆی گەیاندەوە بن دیوارەکەی بەرانبەر دەرگاکە و دانیشت... سەیرێکی ناو قاپەکەی کرد کەمێک شۆربای نیسک بوو، سەموونە ڕەقەکەش دەتگوت بەردە.. قاپەکەی لەبەردەمی خۆی دانا، ڕاڕا بوو شۆربا و سەموونەکە بخوات یان نا... هەوڵی خواردنیدا کەچی مگێزی بۆ نەدەچوو، وەلاینا هەستی کرد گەدەی بەتاڵە و برسییەتی... دواچار بە ناچاری سەمونەکەی لەسەر ئەرز دانا و بە مستێک کردییە چەند پارچەیێک و پارچەکانی لە شۆربای نیسکەکە هەڵدەکێشا و چاوی دەنووقاند و لەناو دەمی دەپەستا، پاش کەمێک جووین قووتی دەدا... هێندەی نەبرد سەمون و نسکێنەکەی هەڵلووشی، کەچی هەستی کرد برسییەتی و جارێ تێر نەبووە... قاپەکەی بە پێیان وەلانا و خۆی لە قوژبنی ژوورەکە گرمۆڵە کرد و بیری لە ڕووداوەکەی دوێنێ شەو کردەوە... لە دڵی خۆی گوتی: ئای خوایە چ کەراتییەکم کرد، کوڕە بابە ئەمن و باڕو نادی کوجا مەرحەبا، خۆم تووشی چ کرد، ئای گوو بەشەرەفت سیرۆ، ئەگەر ئەتوو نەتگۆتبا

بار سەنابل خۆشە ئەمن چیشم بەو بەزم و ڕەزمەی هەبوو... باشە دەبی چم لێبکەن... کوڕە دەیاڵڵا خۆ زەلامم نەکوشـــتییە، زۆر زۆر هەندەکم تێهەردەدەن و دوایێ بەڕەڵلام دەکەم... قابیلە ئیعدامم بکەن!... ها، ئەدی داکم... ئای بەگمی قوڕبەســـەر داخوە هەنوکە چ قوڕەکت گرتبیتەوە و لەســـەر تەپڵی ســـەرت دانابی، بەخوای بەگم وابزانم کوڕەکەت فەوتا... ســەری چووە قەبری بابی .... تازە بە هەوەنتە نایێتەوە ســەر دونیایێ... مەگەر خوا.

ئەو ڕۆژەی هەتا مەغریبێکی درەنگ بەمجۆرە بەســـەر برد، هەرچەند جاری دەنگی پۆستاڵی جەللادەکان شرق و هۆڕی دەرگاکانی دەبیست، ڕادەچڵەکی و خۆی ئـامـادە دەکرد وایـدەزانی بەدوای ئەودا هـاتوون، کەچی کەس نـاوی ئەوی نەدەهێنـا، بەمجۆرە نەک ئەمڕۆژە... هەفتەیەک لەسـەر یەک غەریب ڕۆژانە و شەوانە چاوەڕوانی دەنگێک بوو بانگی بکات و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن، کەچی هیچ شـــتێک ڕووینەدا.

ئەم هەفتەیە بۆ غەریب ئازارێکی دەروونی یەکجار ســەخت و دژوار بوو، جگە لەوەی جێگەکەی تەسک و بچووک و تاریک بوو، بۆنی میز و پیســـایی و خوێن وڕ و کاســـی کردبوو، لەگەڵ ئەوەش هیچ ژەمێک ئەوەندەیان خواردن نەدەدایێ تا تێر بخوات و خەمی گەدە و سکی نەبێت... غەریب لە عەزابێکدا بوو مەگەر هەر بەخۆی بزانی چ دەردەســـەرییەکی دەچەشت.

هەفتە ڕابورد، هەر لەگەڵ دەوامی فەرمی ڕۆژی شـــەممە، کـاتژمێر هەشت و نیو لە دەرگا درا، دەنگێک گوتی:

ـــ غەریب؟

ئەم یەکسەر گوتی:
+ بەرێ غەریب... غەریب عەتاوڵڵا کەریم.
_ ئەوەندە گوی مەخۆ... وەرە دەرێ.
دەرگای لێکرایەوە و چووە دەرەوە بە پارچە پەڕۆکێک چاویان بەستەوە و سەرێکی سۆندەیان دایە دەست و ڕایانکێشا، ئەویش خۆی شل کرد و بە هەنگاو بەدوایاندا کەوت.
زۆریان هێنا و برد و ڕایانکێشا، ئەویش خۆی لە گوورە نەدەبرد و ملکەچانە شل شل بە دوایاندا دەڕۆیشت، دەرگایێک کرایەوە بردیانە ئەودیو، غەریب هەستی کرد لە ژوورێکە فێنک بۆنخۆش... بەڵام بێهەست و خوست و بێدەنگ، جەللادێکیان سۆندەکەی لەدەستی وەرگرت و پەڕۆیەکەی سەرچاوی لادا و پێیگوت:
_ سەرت شۆڕکە... نەجوولێی... تەمەشای هیچ لایەکت ناکەی... ئەگەر قسەشیان لەگەڵ کردی هەر بە سەرشۆڕی وەڵامی پرسیاران دەدەیەوە... تێگەیشتی؟
غەریب سەری شۆڕکرد و بە ئاستەم جووڵاندی و گوتی:
+ بەرێ تێگەیشتم.
نزیکەی چارەگە سەعاتێک بەمشێوەیە مایەوە، لە پڕ دەنگێک تەزاندنی (هەمان دەنگە قەبە و گڕەکە) بوو:
_ ها غەریب.... ئیسراحەتت کرد؟
غەریب نەیزانی چۆن وەڵامی بداتەوە و چ بڵێ!
جارێکی تر دەنگە قەبە و گڕەکە:
_ زۆر باشە... ئێستا پێم بڵێ برادەرەکانت کێن، سەر بەکێن و لە چ حزبێکن و کێ هانیدای جنێو بە ڕەئیسی دەوڵەت بدەی.

+ چ بڕێم گەورەم، بەسەری داکم نازانم چ بڕێم.
کابرا:
_ بابا ... باش دەزانی چ بڕێی.. خۆت غەشـــیم مەکە زۆری وەکی توومان لێرە بە قســـە هینا و ئیعترافمان پێکردن و تڕاندمانن... قســـەی بکە.
+ چ بڕێم.
_ ئاههە.. پێم بڕێ برادەرەکانت کێن؟، کوو ئیش دەکەن؟
+ گەورەم ئەمن دوو برادەرم هەیە.
کابرا:
_ ئێ ئێ ئافەرین.. ئێ ئەو دوو برادەرەت کێن؟
+ یەکیان... سیرۆی مەجیدە خێلییە، لە تەیراوەی نەک بەخۆی بابیشی بەناوبانگە، ســیرۆ بیســت و چار ســەعاتی خوای ســەرخۆشــە، عارەقی مەستەکیش نەبیت ناخواتەوە... بەس یەک عەیبی هەیە گەورەم.
کابرا، هەڵسایەوە و لە غەریب نزیک بووە:
_ ئێ ... ئەو عەیبەی چییە؟ چ عەیبەکی هەیە.
غەریب:
+ زراوی لە پشـــیلەی دەچی ... هەر هەندە چاوی بە پشـــیلەی کەت، چۆکی دەلەرزی و ناتانی یەک دەقە بە پێوە ڕاوەستی.
کابرا کەمێک تووڕەبوو، بەڵام بەسەرخۆیدا نەهێنا... کەوتەوە پرسیار:
_ ئێ ... ئەدی برادەرەکەی دیت... دووەمیان.
غەریب، زۆر بە ڕوژدی گوتی:

+ کێ ... جەبارە قەڵەو... وەڵڵاهی گەورەم ئەو قەشـــمەرە بە حەیاتی سەرخۆش نابی... لەگەرەمە دانیشتییە یەک بوتڵی عارەق هەڵقوڕاندییە، کەچی تەقەی سەری هاتییە، بەس یەک عەیبی هەیە گەورەم.
کابرا بە هەشتاوی چووە پێش و پرسی:
ـ ئێ ... عەیبەکەم پێبڵێ... بزانم چییە؟
غەریب:
+ گەورەم... ئەو جەبارە قەڵەوە ... ئەو شینە زەلامە ... زوو زوو برسـی دەبی... جەمی بە جەمەکیدی ڕاناگات... خۆ ئەگەر برســـیش بوو چ نەبی بخوات، وەکی منداران دەست بە گریانێ دەکات.
کابرای دەنگ قەبە و گڕ ئارامی لێبڕابوو، پرسییەوە:
ـ ئەدی ئەتوو... ئەتوو بەخۆت چ دەکەی و کێ لە پشتتە؟
+ لە داکم زیاتر کەس لە پشـــتم نییە... هەر ئەوە لێناگەڕێ موحتاجی دەستی نامەردان بم... پارەم دەداتێ و ئەمنیش بە مەشرۆبی دەدەم... بەس گەورەم لێت ناشارمەوە ئەمنیش عەیبەکی گەورەم هەیە.
کابرا خەنی بوو، لە دڵی خۆی گۆتی ئێســتا هەموو شــتێک ئاشـکرا دەکات و ئیعترافمان بۆ دەکات... زیاتر لێی نزیک بووەوە و پرسی:
ـ برێ ... عەیبەکەی خۆت برێ و هیچ مەترسێ.
غەریب زۆر بە خەمبارییەوە گوتی:
ـ ئەمن وەکی ئەو عــالەمەی نــازانم مەزەی لەگەڵ جن و عــارەقی بخۆم... هەمە و نیمە ئەو ڕەحەتە لوقمە ســـۆرمیە کە لە دوکانی ئەنوەرە کۆری هەیە... بڕوا بکە گەورەم نیو بوتــڵ عــارەقی بە دوو کەرتکە لوقمان فت دەکەم.

کابرای دەنگ قەبە و گڕ قوشقی بوو، شێت و هار، ئەوە یەکەمین جار بوو زیندانییێکی لەم جۆرە ببینێ و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکات... دوودڵ و ڕاڕا بوو، چی لەو گەنجە بکات، چاک دەیزانی بەسەرخۆشی و لەناو بارێکی شەوانە گرتوویانە و لەلای خۆیان هێشتوویانەتەوە... بەگوێرەی ئەزموونی خۆی هیچ هەستێکی لەلا دروست نەبوو کە ئەمە لە سیاسەت تێوەگلابێت و بە بەرنامە ئەم قسانەی لەبارڕ کردبێت، دواجار بڕیاریدا بیبەنەوە ژوورەکەی خۆی، کاتێک جەللادەکان ویستیان پەلکێشی بکەن... کابرا بە چرپە پێیانی گوت:

_ نەکەن ئازاری ئەو گەنجە بدەن... بیبەنە ئینفرادییەکان و تێکەڵی کەس نەبێت تا کات و ڕۆژی خۆی دێت.

ئیتر بردیانەوە، بەڵام بۆ ژووری خۆی نا، خستیانە ژووریک غەریب هەستی کرد چەند ژوورێکی دی لەتەک ئەوانە، وای هەست کرد چەند ژوورێکی تاکەکەسی بەرانبەر یەکن لە هۆڵێکی نیمچە گەورە.

***

بەگم لە ژوورەکەی خۆی لەناو حەساریَ تۆتکەی نەدەگرت، لەوەتەی غەریبۆکەکەی بزر بووە و کەس پێینالێ لە کوێیە؟! ئاخر مەعقوول نییە زەلامێکی گەورە و گران لە هیکڕا بزر بێت، عارد قووتی دا، ئاسمان هەڵیلووشی، بەڵام لەسەردەمی ئەم ڕژێمە و لەم بارودۆخەی جەنگە نەگریسە هەموو شتێک مەعقولە، نەوەک غەریب، دارو دەستەی دەسەڵات ڕۆژانە وەک سەگی هار بەربووبوونە ناو خەڵکی هەژاری ئەم شارە و بەدەمیانیان لێدەگرتن و بزریان دەکردن.
بەگم هەر دەهاتە پێش دەرکەی حەساریَ و ئاوڕێکی ڕاست و چەپی دەدایەوە و کە کەسی نەدەبینی بە بابەڕۆ و لەخۆدان دەگەڕایەوە ناو حەساریَ و بەبیَ جەنازە شینی دەکرد، نە ئاگای لەخۆی نە لە حەمام و ئیش و کار مابوو، هەرکەسێکی دەدیت هەواڵی غەریبەکەی خۆی لێدەپرسی، کە هیچی دەستنەدەکەوت لە پڕمەی گریانێی دەدا.
بەیانییەک هێشتا هەر لەناو جێو بالینگانێدا و گینگڵی دەدا، لەگەڵ تەقەی دەنگی دەرگای ژوورەکەیان ڕاچەنی... هەر لەگەڵ تەقەی دەرگاش دەنگێک هاواری کرد:
_ پلە بەگم، پلە بەگم بەخەبەری؟ نەنووستی؟
بەگم بە هەشتاوی ڕاپەڕی و چوو دەرگای کردەوە... سیرۆی مەجیدە خێلی بوو.. بەگم بە دڵەکوتەو بە ڕاڕایی پرسی:
+ سیرۆ... بابەکەم چت بیستییە... دەرێی خەبەرەکی غەریبۆکەت لۆ هینایمە.
سیرۆ پیلی پلکە بەگمی گرت و بردیەوە ژووریَ و گوتی:
_ وەرە... وەرە دانیشە با دوو قسان بکەین.

هەردووکیان چوونە ژوورەوە دەرگایان داخســـت... هەر دانیشـــتن ســـیرۆ تەقاندییەوە:

_ غەریب گیرایە؟

+ (بە گریانەوە) لە کێندەرێ گیرایە؟

_ لە دائیرەی ئەمن... لەناو بارِی لەگەڵ ئەمنان بەشـــەرِ هاتییە و جوونی بە سەدام حوسێنی دایە.

+ ئەیرِۆ... مارم کاول بوو... سەدام حوسێن؟!!

_ ئەرێ وەڵڵا ســەدام حوسێن !!، چەند رِۆژە نەچووبوومە بارِ سـەنابل... دونێ چووم...لەناو بارِی هەر باس باســی غەریبی بوو، وەڵڵا ئەمنیش بە دزی بۆیێکم بردە پەنای و لێم پرســـــی... هەینێ پێکەتم کە غەریب چ کەتنەکی گەورەی کردییە.

بەگم دەستی بە گریانێ کرد، سیرۆ هێوری کردەوە و گوتی:

_ هەوکە وەختی فینگە فینگ و گریانێ نییە... دەبی عیلاجەکی ئەو کورِەی بکەین... پێرِانەگەین دەیکوژن... ئەوانە غەدارن غەدار.

بەگم بە قســـەی کرد و بە لچکی کراســـەکەی بەر چاو و کەپووی سرِییەوە... هەینێ بە پارِانەوە گوتی:

+ چ بکەم؟ تەگبیرم چییە؟ کو لەدەست ئەو جەللادانەی قوتار بکەم.

سیرۆ دائیشتنەکەی گۆرِی، چووە باری لەسەر چۆک دانیشتن، ئینجا گوتی:

_ گێ بدێ پلە بەگم... ئەمن برادەرەکم هەیە جاشی شوکر سەلیمییە، زۆر باســـی وی دەکاتن، دەرێ لە دائیرەی ئەم زۆر تەقدیری دەگرن و بە قســـەی دەکەن، مەفرەزەی ئەمنی هەیە و لەناو شـــاری کول فیکولە...

ماریشیان لە ئیسکانە، برۆ ماریبان لەوی وەدەکەم برادەرەکەم بتباتە کن شوکری، هەینێ لەوی بگرێی و برێ عیلاجەکی غەریبۆکەم لۆ بکە.

بەگم پرسی:

+ ناوی برادەرەکەت چییە؟

_ عەلی... عەلیە سۆری ناوە.

***

بۆ عەسرەکەی بەگم بە پێیان ڕێگای نێوان تەیراوە و ئیسکانی کوتاوە، چ پرسیاری نەکرد، لە مەخفەری پۆلیسی هەورازبووەوە بەلای دەستە ڕاست ئاوڕی دایەوە، بەر دەرگای خانووێکی بینی کە قەرەباڵغ بوو، پڕ بوو لە خەڵک و لە ترومبێل، یەکسەر چوو... لە پێش دەرگا جاشێکی پاسەوان لێی هاتە دەنگ:

_ ها پیرێژن چت دەوێ؟ چاو لەکێ دەگێڕی؟

بەگم بە زمانێکی تەتەڵە و بە ترس و لەرزەوە گوتی:

_ عەلی ... عەلییە سۆرم دەوێ... هاتیمە عەلییە سۆری ببینم خزمەمانە.

پاسەوانەکە، تفەنگەکەی بە شانی دادا و کەمێک چووە ژوورەوە و لەڕاست دەرگاێکی گەورە هاواری کرد:

_عەلی ... عەلییە سۆر.

دەنگێک لە ژوورەوە ڕا:

+ ها ها... چت دەوێ؟ لۆ بانگم دەکەی؟

_ وەرە... مێوانت هەیە.

هێندەی پێنەچوو، زەلامێکی سوورکەڵەی کلاشینکۆف لە شان بە دیارکەوت... بەگم زانی هەوە یەکسەر لێی چووە پێشێ، سوورە گوتی:

+ ها دایە چت دەوێ؟ ئەمن دەناسی؟

_ ئەدی کوو ناتناسم .. ئەتوو عەلییە سۆر نی؟

+ با عەلییە سۆرم، خۆ کفرم نەکرد.

بەگم یەکسەر قسەی پێ بڕی:

_ ئەمن پلکی سیرۆیمە... سیرۆی مەجیدە خێلی...ئەو گۆتی بڕۆ کن عەلییە سۆری برادەرمە.

عەلی... کەمێک بێدەنگ بوو، ئینجا هەڵوەستەیێکی کرد... بە کاوەخۆ گوتی:

+ باشـــە بەخێربێی... مادام پلکی ســـیرۆی پلکی منیشـــی فەرموو ئەمرکە.

_ زاڵم ئەمر نەکا... دەمەوێ کاک شوکر سەلیمی ببینم.

+ لۆ... چ ئیشـــت بە کاک شـــوکری هەیە؟، چت لێ دەوێ؟، پارە و ئازووقە؟

_ ناوەڵلا کوڕم خۆ ئەمن دەرۆزەکەر نیمە، دەمەوێ بیبینم ئیشـــەکم پێی هەیە.

هەینێ عەلییە ســـۆر لەبەر خاتری ســـیرۆ و ئەو پەیوەندییە چاکەی لەگەڵیدا هەیتی.. دڵی نەرم بوو، گوتی:

_ باشە ... ئەتوو جارێ برۆ ژۆرێ لۆ ناو ژنان... دەچم بزانم چ دەرێ.. مەجالی هەیە یان نا.

بەگم هەوراز بووە و چووە دیوی لای ژنان، عەلییە سوور کەمێک خۆی رێکخســـت و تفەنگەکەی بردە ژوورەوە.. ئینجا چووە لای دیوەخانێ... ســـەیری ژوورەوەی کرد شـــوکر و دووکەســـیدی دانیشـــتبوون خەریکی چایەخواردنەوەن، عەلی بەژوورکەوت و کۆخەیێکی کرد، شـــوکر ســـەری هەڵبڕی و عەلی بینی.. هەڵیدایێ:

+ ها عەلی ... چ هەیە؟، چت دەوێ؟

_ کاکە پیرێژنەکی تەیراوەی هاتییە، پلکی برادەرەکمە... دەرێ حوکمە دەبی کاکەی ببینم.

شوکر:

+ چییە... چیدەوی؟ ئەگەر پارەی دەوێ بەخۆتان شـــتەکی بدەنێ با بڕوا.

+ ناوەڵڵا کاکە دەرۆزەکەر نییە، دەرێ ئیشم بە کاکەی هەیە هەر دەبی بیبینم.

شوکر سەیرێکی دووکەسەکەی لای خۆی کرد، ئەوانیش دەموچاویان وا نیشاندا کە چیتێدایە با بێ... بزانە چیدەوێ.

شوکور: ــ هەڕو بیهینە... بەس پێی برێ زۆری نەرێ.. تاقەتی قسەی ژنانم نییە.

عەلی بەغار چوو بەگمی هینا و گەڕانەوە... هەر لەگەڵ بەژوورکەوتنێ بەگم شـالآوی بۆ شـوکر بردو خۆی هاوێشـتە سـەر چۆکان و بەهەردوو دەستان لە سەروتۆپەڵاکی خۆی دا، گریانێک گریا ژێربوونەوەی سەخت بوو.

شـــوکر:ــ چتە پیرێژن... چت لێقەومایە... لۆ وەها لەخۆت دەکەی... بری بزانم چت لەمن دەوێ هەتا لۆت بکەم؟

هەینێ بەگم... گریانی ڕاگرت و فرمێسـکی چاوانی سـڕییەوە و بە ورد و درشــتی بەســەرهات و قوڕبەســەری و نەبوونی و بەدبەختی خۆی بۆ گێڕایەوە، هەتـا بە گرتن و شـــەڕی نـاو بـاڕ و شـــوێن بزربوونی غەریبۆکەکەی... ئینجا سەری هەڵبڕی و بە شوکری گوت:

ــ قەت کەســـم نییە، یەکەمین خوا دووەمین ئەتو... ئەو کوڕەم لۆ بگەڕێنەوە حەســـارێ شـــەرت و وەعد بی ببمە خزمەتکاری خۆت و مارومندارت.

****

ئەو ژوورەی غەریبی تیا بەندکرابوو، ژووری تر و زیندانی دی تیابوو، هەر بۆیە هەستی بە غەریبی و تەنیایی نەدەکرد وەک ژووری پێشتر...
هەستی ڕادەگرت و گوێی لە دەنگی زیندانیانی دی و ئاخ و ناڵەی خەڵکی دی دەبوو، بەمە زۆر دڵخۆش بوو کە بەتەنیا نییە و دەورووبەری قەرەباڵغە، بۆ شەوەکەی لە ژوورەکەی تەنیشتی تەپەتەپێک هات..
هەستی کرد یەکێک لەودیوەوە بە مست لە دیوارەکەی نێوانیان دەدا...
ئەویش هەر بە مست لێدان وەڵامی دایەوە... هێندەی نەبرد، دەنگێکی خۆش کە غەریب نەبوو بەگوێی غەریبەوە، هەڵیکردە مەقامێک:
( ئەی کوڕی باش... بەخێربێت بۆ ئێرە... تۆ کێی، چ کارەی... ناوت چییە.. لەسەر چی گیراوی؟، چیت کردووە؟ ) ئەمە بە مەقام، بەڵام چ مەقامێک.
غەریب خۆی خڕکردەوە، سەرەتا نەیزانی چ بڵێت، پاشان هەر بەشڕە مەقامێکی لەو بابەتەی دەیزانی، هەڵیدایە:
( سوپاست دەکەم مارەباب، ئەمن ناوم غەریبە هیچ ئیشم نییە... بیست و چار سەعاتی خوای سەرخۆشم... لەبارِ سەنابل هەستام هەندەک قسەی بێ سەروبەرم کرد، برادەران لەوێ بوون و ئەمنیان لێرە پەستا )
دەنگەکە هەر بە مەقام دڵی دایەوە:
(هیچ نییە مەترسە، حیساب بۆ قسەی سەرخۆشان ناکەن، چەند ڕۆژێک لێرەت دەهێڵنەوە وەک سزا پاشان ئازادت دەکەن.. تکایە خەم مەخۆ هیچ نییە ).
غەریب کەمێک دڵی بە مەقامەکە خۆش بوو، هەڵوەستەیەکی کرد، پاشان لە دڵی خۆی گوتی: ئەو دەنگە غەریب نییە.. ئەو دەنگەم زۆر بیستییە... هەر بە مەقام باگۆی دایەوە:

( پێم بڵێ ئەتوو کێی؟ دەنگت غەریب نییە، زۆرم گوێ لەو دەنگەی توو بووە... تخوا مارەباب عەزیزم، خۆت ئاشکرا بکە)

هەینێ دەنگەکە هەر بە مەقام بۆی هەڵسا:

( من حەمەجەزام... دەنگبێژ و گۆرانیبێژم... مەعقول نییە ئەهلی گەعدەبی و من نەناسی... من حەمەجەزام باوانەکەم).

ئیدی غەریب شـــاگەشـــەبوو، هەزار جار خۆی بە قوربان و بە خولامی حەمەجەزا کرد.

کە شـــەو ڕاشـــکا، درەنگانێک حەمەجەزا دیســـان بە مســـت لە دیواری نێوانیانی دایەوە و غەریبیش بە مست وەڵامی دایە...هەینێ حەمەجەزا بە چرپە گوتی:

+ کاکە غەریب، گوێ بگرە بزانە چیت پێدەڵێم.

غەریب هەر بە چرپە:

ـ بڵێ....بڵێ؛ بەچاوان زۆر چاکم گێلێتە.

حەمەجەزا گوتی:

+ ئەتو بەردەبی... بەیانی نا دووبەیانی هەر بەردەبی، چاکەیەکم لەگەڵ دەکەی؟

غەریب:

ـ وەی بەچاوان ئەتوو بەس ئەمرکە مارەباب.

حەمەجەزا:

باش گوێ بگرە، کە ئازاد بووی، دەمەوێ بچیتە لای برادەرێکم ناوی عەبدوڵڵا مەخموورییە... مەڵێ نایناســــم ... لە ڕیزە دوکانەکانی لای مەحکەمەیە، برایەکانی دوکانی وێنەگرتنیان هەیە، بڕۆ بۆ لای کاک محەمەدی برای، پاشاشی پێدەڵێن.. ئەو کاک عەبدوڵڵات بۆ دەبینێتەوە.

غەریب:

_ باشە باش.... ئەوە کاک عەبدوڵڵام دیتەوە... چی پێ بڵێم؟

حەمە جەزا:

+ کە کاک عەبدوڵڵا مەخموریت دیتەوە، پێی بڵێ من لەلای حەمەجەزاوە هاتووم... حەمەجەزا لە دایەرەی ئەمنی هەولێر گیراوە، لەوانەیە بیبەنە هەیئەی خاسەی کەرکووک.. پێی بڵێ حەمە جەزا زۆر سەلامت لێدەکات، بڵێ حەمە گوتی با خەمێکی ماڵ و منداڵەکەم بخوات و لەم شارە بێکەسیان نەکات.

غەریب بە قورگی پڕ لە گریانەوە گوتی:

_ کاک محەمەد جەزا، باوەڕم پێبکە بەسەری داکم حەز ناکەم بەربم، چەند ڕۆژە دوعای بەربوونێ دەکەم، بەس مادام ئەتوو لێرەی حەز ناکەم بەربم و بڕۆم.

+ نا کاکە حەزبکە بڕۆی، لێرە مرۆڤایەتیت پێشێل دەکەن، کەرامەتت دەشکێنن، تکا دەکەم حەز بکە بڕۆی... بەڵام بەڵێنم پێبدە کە ڕاسپاردەکەم بە شوێن خۆی دەگەیەنی.

غەریب بە حەماسەوە گوتی:

_ بەسەری داکم بەس لێرە نەجاتم بی، پاش ئەوەی چاوم بە بەگمی داکم دەکەوی، دەبی یەکسەر بچم ئەو کاک عەبدوڵڵا مەخموورییەی ببینم و قسەکانی توی پێ بڵێم.

ئیتر هەردووکیان کش و مات بوون و چوونە ئامێزی خەوێکی هەڵبزرکاو.

***

تازه دەوامی فەرمی دەستی پێکردبوو، بەیانی زوو بوو، شوکر سەلیم و جەماعەتەکەی بە سێ ترومبێلی پڕ لە چەکدار چوونە ناو دایەرەی ئەمن، هەرکە دابەزین، عەلییە سوور خۆی گەیاندە شوکر و پێی گوت:

_ کاکە ... کوڕی پیرێژنێت لەبیر بێ... فەقیرەی زۆر گوناحە.

شوکر بە توڕەییەوە ئاوڕی لێدایەوە و دەمکوتی کرد:

+ باشە باش دەنگت نزم بکە، لەبیرمە زۆری مەرێ.

پاسەوان و دارودەستە لە حەوشەی گەراج مانەوە، ئەو بەژوورکەوت یەکسەر بۆ لای ژووری بەڕێوەبەر، هەر دانیشت و پاش چاکوچۆنی، شوکر گوتی:

_ سەیدی، شەوێ تەلەفۆنم لەگەڵ کردی سەبارەت بە پیرێژن و کوڕە سەرخۆشەکەی... لەبیرت مایە؟

بەڕێوەبەر هەڵسایە سەرپێ و لەپشت مێزەکەی هاتە دەرەوە و چوو لە بەرانبەری دانیشت... ئینجا گوتی:

+ لەو بڕوایەی ئێمە شتەکی ئەوها لەبیر بکەین؟

شوکر کەمێک دڵی خۆش بوو، یەکسەر گوتی:

_ ئێ ... ئەوجا ئەمرت لەسەر چییە؟

بەڕێوەبەر پاڵی داوە و پێی لەسەر پێ دانا و گوتی:

+ سبەینێ زوو کە هاتم، پێمگۆتن لە ئینفرادیی دەریینن و بیهێنن توالێتەکانی ناو دایەرەی پێ خاوێن بکەنەوە. ئێستا لەوێیە تەنزیفات دەکات ... ئەویدی عایەدی خۆتە.

_ یەعنی ئێستا دەتانم بچم بیبینم؟

+ ئا ئا دەتانی... بەڵام وەکی پێمگۆتی باش تەعلیمی بدە.

شوکر هەڵساوە و گوتی:

ـ بەسەرچاو گەورەم... خەمی ئەوەت نەبی وایلێدەکەم مووی نەپسێنی...
جارێ بە ڕوخسەتت.
لە ژووری بەڕێوەبەر هـاتە دەرەوە لە مەمەڕەکە یەکسـەر بەرەو لای
توالێتەکـان چوو گوایە نیـازی میزکردنی هەیە، چووە ژوورەوە غەریـب
سـەرقاڵی خاوێنکردنەوەی شـوێن و ئینجانەی میزکردن بوو، شـوکر بە
ئەنقەست چووە تەنیشت ئەو ئینجانەیەی کە غەریب خەریکی بوو، ئاوڕێ
لێ دایەوە و سەیرێکی کرد، غەریبیش هەستی کرد کە ئەو پیاوە سەیری
دەکات، ئەویش دەسـتی هەڵگرت و تەماشـای شـوکری کرد، شـوکر بە
تووڕەیی لێیخوڕی:
ـ چییە کورە... لۆ وەها تەماشام دەکەی دەمناسی؟
غەریب بە بزەوە:
+ ناوەڵڵا ناتناسم، بەحەیاتم ئەتووم نەدیتییە.
ـ ئەوە چ دەکەی لێرە... ئەتوو سجنی یان موستەخدەمی ئێرەی؟
غەریب:
+ گەورەم ئەمن سـجنم، لە سـبەینێوە ئەمنیان هینایتە ئێرە ئەو هەموو
خەلایانەم پاککردیتەوە.
هەینێ شـوکر پیلی گرت و بردیە دەرەوەی ئاودەسـتەکان، ئینجا لێی
پرسی:
ـ ئەتو ناوت غەریبە؟ داکت ناوی بەگمە؟
+ بەرێ گەورەم ئەرێوەڵڵا ئەمن غەریبم... کوو دەمناسی؟
ـ کوو ناتناسم... نەک ئەتوو داکیشت دەناسم... دەشزانم بە سەرخۆشی
پەتکت پساندییە و جوونت بە ڕەئیسمان دایە.
غەریب یەکسەر:

+ گووم خوارد بەسەری داکم نەمزانی سەرخۆش بووم.
شوکر:
_ هەر گووخواردن بەس نییە.. ئەتوو دەبی تۆبەی بکەی و پەشـــیمانیش ببیەوە.
+ تۆبەی دەکەم... پەشیمانیش دەبمەوە.. بەس لێرە قوتاربم.
شوکر هەینیێ بەتەواوی بەسەر غەریبۆکەیدا زاڵ بوو، پێیڕاگەیاند کە ئەو دەتوانی هەر ئێســــتا ئـازادی بکـات، بەڵام بە مەرج... مەرجەکەش، یەکەمیـان دەبییە چەکـدار لە کنە من، دووەم هەر چـاوەکـت دەکەیە چارچاو، هەر شـتەکت دیت یان هەر شـتەکت گێ لێبوو دەبی خەبەرمان بدەیێ، داکیشت دێتە کنە مە ڕۆژێ بە ڕۆژێ خزمەتی دیوی لای ژنان دەکات.. ڕازی؟
غەریب بە هەڵپەوە:
_ ئەمن بە قوربانت دەبم ... هەزار جار ڕازیم.
شوکر دڵنیای کردەوە:
+ دە کەواتە هەر ئەوشۆ لێرە دەمێنییەوە، لەکن ئەو توالێتانە ... سبەینێ دێمەوە لەگەڵ خۆم دەتبەمەوە و تەسلیمی بەگمێت دەکەمەوە.
***
شـــەوەکەی غەریب لەناو توالێتەکان مایەوە، بەڵام یەک چرکەش خەو نەچووە چـاوانی، یەکەم لەبەر ئەوەی چـاوەڕێی بەیـانی بوو ئەو پیـاوە فریشـتە ئاسـایە دێ و بەریدەدات، دووەم لەبەر بۆنی ناخۆشـی توالێتەکان هەراســـان بوو، تا بەیانی ئەمســـەر و ئەوســـەری توالێتەکانی کرد و دادەنیشت.

بۆ ســــبەینێ دەوام دەســـــتی پێکرد و هاتوچۆ لەنێو ڕاڕەو و ژوورەکان پەیدابوو، خەڵک دەهاتن و لە توالێتەکان دادەنیشـــتن و لە چوونە ژوور و هاتنە دەرەوە بە مۆڕی تەماشـــای غەریبیان دەکرد و بە ڕقەوە ســــەریان بادەدا... غەریبیش فەقیرۆکە لەپەنا دیوارێک خۆی گرمۆڵەکردبوو، لە چاوەڕوانیدا وەخت بوو دڵی بتەقێت.

دەورووبەری ســەعات (١٢) ی نیوەڕۆ، عەلییەسـوور بە جلکی ســەربازی هات و لێی چووە پێشــێ... غەریب گەشـایەوە و یەکســەر قیت بووەوە... عەلی گوتی:

+ غەریب دەبی لەمەودوا ئاقربی... وەرە بەگەرم بکەوە.

عەلی ڕۆیشــــــت و غەریـب وەکوو کوچکوچە بەگورگە لۆقە بەدوای کەوت،... هەتا ڕۆیشـــتە پێش دەرگای ژووری بەڕێوەبەر، لەوێ غەریب ڕاوەســـتا و عەلی چرپاندییە بە گوێی کابرای نووســـینگە، کابرا چووە ژوورەوە و یەکسەر هاتە دەرەوە و غەریبی ئیزندا بچێتە ژوورەوە.

لە ژوورەوە بەڕێوەبەر بەخێرهاتنی کرد و پێیگوت:

_ ئەتوو هەقی ئیعـدامـت هەبوو، دەزانی بۆ؟ چونکە کفرت کردییە، جوونت بە ڕەئیس و لقائید داوە، بەڵام لەبەر حورمەتی ئەو پیاوەی لێت خۆش دەبین، بە شـــــەرتێـک لەمەودوا کەمتر بخۆیەوە و زۆرتر خۆت سەرخۆش بکە، چت بیست چت دیت بەو پیاوەی دەڵێی...ئیشی توو ئەوە دەبی تێگەیشتی؟

غەریب بە ترس و لەرزەوە:

+ بەرێ گەورەم... زۆر مەمنوون... زۆر مەمنوون.

ئیدی شوکر پیلی گرت و هێنایە دەرەوە و لەگەڵ خۆی سواری ترومبێلی کرد و بردییەوە تەیراوە و لەپێش حەســــاریێ هێنایە خواریێ... بەر لەوەی بەجێی بهێڵێ، پێی گوت:

ـ برۆ چەند ڕۆژەک ئیسـراحەت بکە، کەمتر ئارەقی بخۆوە، ئاگات لە زمانت بی لەکن کەس باســــی دایەرەی نەکەی، دوایێ لەدوو خۆت و داکت دەنێرم ...باشە؟

هەرکە ترومبێلەکانی شوکری بەر دەرگای حەسارێیان بەجێهێشت، غەریب بەرەو دەرگای گەورە هەنگاوی هەڵێنا، ئیدی منداڵەکانی ناو حەســـاریێ کردیانە هات و هاوار و هەواڵی گەڕانەوەی غەریبیان بە بەگم گەیاند.. ئەو گەیشتە ناوەڕاستی حەساریێ لەلای بەلوعەکە بوو، بەگم بە غاردان و بە باوەشی کراوەوە هات و خۆی بە کوڕەکەی دادا، هەردووکیان دەستیان لە ملی یەکتر کرد و لە هاڕەی گریانێیاندا، خەڵکی حەســـارێش هەموو خڕبوونەوە و لەگەڵ دایک و کوڕە تازە ئازادەکەی گریان و فرمێســـکی خۆشیان هەڵڕشت، بەتەنیێ سەیدە فشە دوور بە دووری ڕاوەستابوو سەیری دیمەنەکەی دەکرد و بزە و ڕق و کینەی تێکەڵاوکردبوو، سـمێڵە ڕەشـە قەترانییەکەی دەکرۆشت، دیمەنی دەست لەملانیێ و گریان و فرمێسکی خۆشـی بەردەوام بوو تا کەریم هەلهەلە پیلی دایک و کوڕەکەی گرت و بۆ لای ژوورەکەی خۆیانی بردن، لەوی لەبەر دەرگاکەیان دانیشـــتن و خەڵکی حەسارێش دەورەیان دان و غەریبۆکەیان بەخێرهاتن دەکردەوە.

بزە و پێکەنین و ئۆخەی ئۆخەی بەگم تێکەڵاوی بزەو خۆشــــی خەڵکە خزمدۆستەکەی حەساریێ بوو، کەچی سەیدە فشە لێیان هاتە پێش و بە پەلار هەڵیدایێ:

+ ها غەریبە مراوی، ئەوە چ کەتنەکت کردبوو ئەوهایان لە کونە ڕەشێ پەستای؟

غەریب بە توڕەییەوە سەیری کرد و گوتی:

_ سەید جارێ برێ بەخێرییەوە... ئەوجا چت لەناو هەناوە ڕەش و بۆگەنییەکەت هەیە، هەڵیرێژە.

+باشە باش..ئەمن عەنتیکەم پێدێ ئەو هەموو شەوە کوو بەبێ مەشرووب هەرتکرد و شێت نەبووی؟

بەگم بە چوستی قیت بووەوە و پەلاماریدا:

_ سەیدە فشە ئەگەر قسەی باش نازانی.. دەوت بگرە و قسەی خراپ مەکە.. باشە، باش قادرە فشە ئەتو کەینێ ماندی دەبی و واز لەو تەبیعاتە ناشرینانەت دەینی؟ بڕۆ بڕۆ لەخۆت هەردە هەتا نەمکردییە سینەمەی ئەو حەسارەی.

سەید عەبدولقادر زانیی بەگم زۆر تووڕەیە و لەوانەیە بیقەومێنێ... لە ترسان ملی شۆڕکرد و لە حەسارێ چووە دەرێ.

هەینێ خەڵکەکەش جارێکیدی بەخێرهاتنەوەی غەریب و چاوڕوونیان لەبەگم کرد و وردە وردە پەرتەیان لێکرد.. دایک و کوڕ چوونە ژوورەوە دانیشتن و دانەنیشتن چوکلێتە فەندی لە دەرگایدا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

_ بەگم خوشکم... مەولوودەکەت لەبیرنەچی.. شەرتت کرد گۆتت غەریبۆکەم بەربی دەبی مەولوودەکی لە حەساری بگێڕم لە هەموو تەیراوەی دەنگ بداتەوە.

بەگم هەر بە هەمان تۆنی چوکلێتە فەندی گوتی:

+ باشـــم لەبیرە... خەمت نەبێ ئەمن هەر لەســـەر قەولی خۆمم... مەولوودی پێغەمبەری لەو حەســـارەی دەخیننەوە. ئینجا جارێکی دی غەریب دەستی لەملی دایکی کرد و هەردوو دەستی ماچکرد، بەگمیش هەر ئۆخەی ئۆخەی بوو، پاشان بۆ کورەکەی گێڕایەوە کە چۆن سیرۆ رێی پێشـــاندایە و بەرێگای برادەرێکی کە ناوی عەلییە ســـۆرە خۆی گەیاندیتە شوکر سەلیمی ئامر مەفرەزەی ئەمن.

غەریب ئینجا زانی کە ئەو کەســـەی بووە هۆی ئازادبوونی ئەوە شـــوکر ســـەلیمە و ئـامر مەفرەزەی ئەمنە، لەپڕ غەریـب بەڵێنەکەی کە بە حەمەجەزای هونەرمەندی دابوو بیرکەوتەوە و یەکسەر هەڵسایە سەرپێ، داکی گوتی:

_ ها.. خێرە لۆ کێ؟ جارێ ئیسراحەتت نەکرد؟

غەریب: ئیشـــەکی زۆر موهیمم هەیە دەبێ بچم هەتا تاریک دانەهاتییە جێبەجێی بکەم.

بەگم: ئێ کوڕم ئەتوو چرکنی ... چەنـد رۆژە ئـاوەکـت بەخۆت دانەکردییە... با ئاوت لۆ گەرم بکەم خۆت بشۆ.

غەریب بەرەو دەرگای ژوورەکەیان چوو ئاوڕی لە دایکی دایەوە:

_ بەســـەری دایەی کەڵکی تاخیربوونی نییە، با بچم ئەو ئیشـــەی بە ســـاحێب بکەم... لەبەر خاتری توو دەچمە حەمامێ لەکن کامۆی خۆم دەشۆم.. جارێ خوا حافیز.

بەپەلە لە حەســـاری دەرپەڕی و هەوراز بووەوە بۆ لای رێزە دوکانەکانی لای مەحکەمەی.

***

هێشـــتا تازە عەسـر بوو، غەریب لەلای ڕیزە دوکانەکان چاوی دەگێڕا و لەولای ئەملای دەرِوانی، لە دوکاندارێکی پرسی:

_ بێزەحمەت... دوکانی کاک محەمەد مەخمووری مســـەوەرِ کێهان هەوە؟

پاش ئەوەی کە کابرای دوکاندار بە ئیشارەت تێیگەیاند کە کامە دوکان هەوە... غەریـب چوو و لەدەرگـای دوکـانێ بەژوورکەوت... بینی دوو کەس لە دوکانەکە دانیشتوون.. دوای سڵاوکردن، گوتی:

+ بێزەحمەت کامەتان کاک محەمەدن؟

یەکێکیان گوتی:

_ فەرموو کاکە ئەمن محەمەدم، ئەمرکە.

غەریب ســـەیرێکی کـابرای تەنیشـــت محەمەدی کرد و بە ترس و دڵەراوکێوە گوتی:

+ زاڵم ئەمر نەکا... ئەگەر زەحمەت نەبی ئیشـــم بە کاک عەبدوڵڵای برات هەیە.. کوو بیبینمەوە؟

محەمەد بە زەردەخەنەیەکەوە ئاماژەی بۆ کابرای تەنیشتی کرد و گوتی:

_ ئەوە عەبدوڵڵای برامە... فەرموو چ ئیشەکت پێی هەیە؟

لەو کاتەدا عەبدوڵڵا مەخمووریش هەڵساوە و فەرمووی لە غەریب کرد و هێنایە لای خۆی لەسەر کورسییێک داینا، ئینجا گوتی:

_ ها کوڕی قۆز! چ ئیشەکت بە من هەیە؟

غەریب هەندەک داما... پاشان سەری هەڵبڕی گوتی:

+ کاک عەبدوڵڵا ... ئەمن تازە ئەوڕۆ ســـبەینێ لە دائیرەی ئەمن بەربووم... ڕاسپاردەیەکم پێیە.. بەسەری داکم ئیسراحەتم نەکرد.. گۆتم دەبی ئەو ڕاسپاردەی بگەینم.

عەبدوڵڵا مەخمووری کەمێک داما و بیری کردەوە ... پاشان گوتی:
_ کاکە ئەتوو دڵنیای ڕاسپاردەکە لۆ منە؟ لۆ عەبدوڵڵا مەخمووریيە؟
+ ئەها بەسەری داکم ، ئەو گۆتی برۆ کنە وی.. دەنا ئەمن نە ئەتوو نە ئەو کاک محەمەدەی ناناسم.
_ ئەو... ئەو کێیە؟ قسان بکە.
+ کاک محەمەد جەزای هونەرمەند، لە سجن پێکەوە بووین، دیوار بە دیوار... ئەو گۆتی برۆ بیبینەوە.
مەخمووری بەپەلەبوو، بۆیە زوو بەزوو گوتی:
_ ئێ ... چی گۆت.. گۆتی چ پێم برێ؟
هەینێ غەریب پاڵیداوە و بەشێنەیی کەوتە قسان:
+ کاک محەمەد جەزا سەلامی هەبوو، گۆتی ئەمن وا لێرەمە بە کاک عەبدوڵڵای برێ با خەمەکی مارو منداڕەکانم بخوات و بێکەسیان نەکات.
ئیدی مەخمووری هەڵساوە و تۆقەیێکی گەرمی لەگەڵ غەریب کرد و پێیگوت:
_ کوڕە گەنج ... ڕاسپاردەکەت گەیشت ئەوجا ئەتوو برۆ خوا ئاگادارت بی.

***

ڕۆژی پاشتر عەسرەکەی... ناو حەساریٚ جمەی دەهات لە خەڵک و لە میٚوانان بۆ مەولود خویندنەوە سەید ئیسماعیل و دارودەستەکەی ساز و ئامادە بۆ مەولوود خوێندنەوە هاتبوون، لە بنەبانێش مام حوسێن کێشکەیی لاوکوحەیرانبێژ شان بەشان لە تەک کەریم هەلهەلە و چوکلێتە فەندی دانیشتبوو، ئیدی مەولوود دەستپێکرا، دەنگی شووشەیی سەید ئیسماعیل و زرینگەی دەف و سەڵاوات ئاوێتەبوون و هەموو حەساری مەست و حەیران کرد، پاشان شیرینی و شەربەت بەخشرایەوە، بە قەولی بەگم مەولوودێکی گەرم و گوڕیان بەڕیٚ کرد، پاشان سەید ئیسماعیل و جەماعەت بەڕێزەوە بەڕیٚ کران و خەڵکەکە تێر شیرینی و شەربەت و چایە بوون، ئینجا میٚوانەکانی حەساریٚ ڕوویان لە مام حوسێن کێشکەیی کرد و داوای لاوک و حەیرانیان لێکرد... مام حوسێنیش بەم شێوەیە تێیهەڵکرد:

ئای دلال، ئای دلال، ئای دلال هایێ هایێ هایێ

بیست و پێنجی مانگی ئاداریٚ

چبکەم گوڵ دەپشکفتن

بەچ دەوران بە چ زەمانان کە سۆرە گوری بواران بە نێرگزان ڕادەگەیشتن



ڕۆژی پاش مەولوودەکە، بەیانییێکی زوو ترومبێلێکی نیســـــان پەترۆڵ لەبەر دەرگای حەساریێ گیرسایەوە و هەندەی بلێی یەک و دوو غەریب و بەگمی دایکی ســــوارکران و ترومبێل بەگەڕ کەوت و ڕووە و گەڕەکی ئیســـــکان ملینا، لەویێ غەریب بووە چەکدار و جاش مەفرەزەی ئەمن و دایکیشــی لەدیوی ژنان ســەرافەتی چێشــت و خواردنی ژنەکانی ماڵێی پێسپێردرا.

غەریب چەند ڕۆژێک بە چەکداری و دوور لەبەزموڕەزمی خواردنەوەی گوزەرانــد، ئیتر ئـارامی لێبڕا... ئێواران هەرکە واجبی تەواو دەبوو بە پەلەپەل خۆی دەگەیاندەوە تەیراوە، لەوی لەگەڵ ســــیرۆ و جەبارە قەڵەوی یەکیان دەگرتەوە و کۆڕی دەمتەڕکردن و سەرگەرمکردنیان ساز دەداوە.

جار جارە کە ســەریان گەرمدەکرد و غەریب بەتەواوی دانتری دەبوو و تێر ئارەق و ڕەحەتە لوقمە سوورەکە دەبوو، سیرۆ بە سەگایەتی دەیگوت:

_ کاکە ســـبەی هێواریێ کە لە واجب هاتییەوە، بە ســـێیان دەچینە باڕ سەنابل لەویێ دادەنیشین.

غەریب بە زمانێکی قوڕس و بە نیمچەلاڵی دەیگوت:

+ نانا بە قوربان نە... هەموو جێیەک بەس باڕ ســەنابل نا... پڕی حیز و گەوادە... بـــا تـــووشــــــــی چـــورتـــمەکـــیـــدیـــم نەکەن.

***

چەند مانگێک بەسەر بوونە جاشی غەریب تێپەڕبوو، بەیانییێک وەک ڕۆژان چووە مەقەڕ جلکی گۆڕی و تاقمی بەست و کلاشینکۆ فەکەی کردە شان، لەو دەمەدا جاشێک هات و گوتی:

_ غەریب کاکە بانگت دەکات.

غەریب بە پەلە خۆی گەیاندە دیوەخان، شوکر بە تەنیا لە دیوەخانێ لە هاتووچۆدا بوو، هەرکە چاوی بە غەریب کەوت یەکسەر پێیگوت:

_ غەریب، ئەوڕۆ عەلییە سۆر نایێ... هەڕوو پێنچ نەفەران لەگەڵ خۆت ببە و بڕۆنە خەستەخانەی.

غەریب بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

+ لۆ بچینە خەستەخانەی کاکە!...خێرە؟

_ هیچ نییە لە شەوێوە سمە ئەبو شواڕب تووشی ژانە سک بووە، بیبەن با دختۆرەک بیبینی بەڵکو عیلاجەکی دەکات.

+ بەسەرچاو کاکە.

غەریب هاتە دەرو پێنچ چەکداری هەڵبژارد و سمە ئەبوو شواڕبیان خستە ناو تڕومبێل و بەرەو تەواری لای نەخۆشخانەی جمهووری بەڕێکەوتن... هەرکە گەیشتنە پێش دەرگا بە هۆڕن لێدان و خۆمشەوەشکردن قاپییان لێکردنەوە و تڕومبێل گەیشتە گەراجی تەواری و بەپەلە سمەیان بەدوو دەستە هەڵگرت و بردیانە ژوورەوە بۆ لای دکتۆر... دوو چەکدار لەگەڵی چوون و غەریب و ئەوانیدی لەلای تڕومبێلەکە مانەوە و سەرو جگەرەیەکیان داگیرساند و کەوتنە چاوەڕوانی، کەچی غەریب سەرنجی کەوتە سەر ژنێکی گەنجی عەبا لەسەر منداڵێکی ساوای لەباوەش بوو، هێندەی پێنەچوو ژنەش هەستی کرد غەریب تەماشای دەکات، ئیدی کەوتنە چاوبازی، پاش کەمێک غەریب جگەرەکەی دەستی فڕێدا و

یاغر یاغر له ژنەکه نزیک کەوتەوه، به تەواوی ڕووخساری هەڵبزرکاوی ژنەی دیت و بینیی که چاوەکانی له فرمێسک ڕشتن بوونەته گۆمی خوێن.. به تەواوی چووه تەنیشت و به ڕاڕایی لێی پرسی:

_ ئەوه لۆ لێرەی... منداره‌کەت نەخۆشه؟

ژنەکه سەرەتا هیچ وەڵامی نەبوو، هەر سەیری غەریبی کرد، پاش کەمێک ئینجا گوتی:

+ کاکه بەخۆم و به مندارەکەم نەخۆشین، لێم قەومایه، بێکەسم، هیچ جێیەک نییه لۆی بچم، بێره داهاتم گوتم با بچم هەندەک لێره دانیشم، کەس ناریَ چت دەویَ؟

_ چت لێقەومایه، قسان بکه هەتا بتوانم یارمەتیت بدەم... قسان بکه.

ژنه هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا:

+ کاکه هەقایەتی من دوور و درێژه... ئەگەر دەتەویَ یارمەتیم بدەی... ئەتوو چەکداری لەدەست ناحەزان قوتارم بکه و پەنام بده.

لەولاوه چەکدارەکانیدی سەیری غەریب و ژنەیان دەکرد و گاڵته و قەشمەرییان پێدەکردن.. ئەوانیش یەکتریان دەدواند و بەردەوام بوون، لەم کاتەدا دوو چەکدارەکه بن پیلی سمەیان گرتبوو هێنایانه دەرەوه و سواری ترۆمبێلیان کرد، چەکدارەکانیش سەرکەوتن، یەکێکیان هاواری کرد:

_ یەڵڵا غەریب با تاخیر نەبین.

غەریب پیلی ژنەکەی گرتوو لەگەڵ خۆی هێنای و سواری ترۆمبێلی کرد، خۆشی سەرکەوت و گەڕانەوه مەقەڕی ئیسکان.

لەویَ که دابەزین، غەریب ژنەکەی بەپێش خۆیدا و بەرەو لای حەرەمی ژنانی برد، لەپەنا دەرگا هاواری دایکی کرد، بەگم هات و هەرکه چاوی

بە غەریب و ژنەی کورپە لە باوەش کەوت حەپەسا و دەمی لێک کردەوە، غەریب زوو بە زوو گوتی:

_ دایە گیان... ئەو ژنە لێیقەومایە و بێکەس و بێ جێیە.. بیبە لای خۆتان و بەخاتوونیش بڵێ با ڕایگری... ئەمنیش دەچم بە کاکەی دەڵێم.

بەگم ژنەکەی وەرگرتوو بردیە ژووێ، غەریب گەڕایەوە و هەر بەغار خۆی گەیاندە دیوەخانێ، لەوێ یەکسەر شوکر لێیپرسی:

+ غەریب... ئەو ژن و منداڵە کێنە لەگەڵ خۆتت هێناینە؟

_ کاکە ئەو ژنە بێکەسە، لێیقەومایە... ئەوەندەی ئەمن تێیگەیشتبم هەراتییە دەنا دەیانکوشت، ئەمنیش زگم پێسووتا لەگەڵ خۆم هێنامەوە.

+ باشە باش... بەس نە بەخۆت نە جەماعەت لە کن کەس باسی نەکەن... تاقەتی مەشاکیلمان نییە.

***

شەوێ لە ماڵێ، غەریب و دایکی دوو پرسیارییان ئاڕاستەی یەکترکرد، بەگم پرسی:

_ ئەتوو ئەو ژنەت لەکێ دیت و کووت هیناوە؟

غەریب بە وردی باسی دیتن و قسەکردنەکەی خۆی و ژنەکەی کرد و پاشانیش گوتی:

+ وەڵڵاهی دایە... بەسەری توو... ئەمن زیاتر زگم بە مندارەکەی سووتا، گۆتم خێری گۆڕی بابم با قوتاریان بکەم.

ئینجا نۆرەی غەریب هات، پرسیار بکات، چووە لای دایکی و دەستی لە ملی کرد و بەلاواندنەوە گۆتی:

+ قوربانی ئەو بەگمەی خۆم بم... هەنووکە ئەتوو پێم برێ ئەو ژنە ناوی چییە، لۆ وەها سەرگەردان بووە و چی لێقەومایە، لۆ وەها هەرمتە بووە؟ دەزانم هەموو قسەکت لێ دەرهینایە.

بەگم، سەیرێکی غەریبی کوڕی کرد و بەهێمنی کەوتە قسە:

_ غەریب گێ بدێ... دوعایان بکە لەسەر ئەو ژنەی تووشی دوژمنداری و شەڕوئاژاوان نەبین.

غەریب یەکسەر پرسی:

+ لۆ ... چما ئەو ژنە چییە؟

بەگم هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا:

_ کوڕم ... ئەو ژنە لە مارە مێردی هەراتییە، دەرێ بە تۆبزی بە مێردییان دامە، لە ترسی باب و برایان خۆم کڕکرد، هەتا ئەو کیژۆرەشم بوو، هەموو ڕۆژێ مێردم لێیدەدام، دارەک لەسەر سەی بوو، دارەک لەسەر من بوو، گوتی ئەورۆ سبەینێ ئاگام لێبوو تفەنگەکی هیناوە

ماریێ گوتم هەبێ و نەبێ بەتەمایە بمکوژێ... ئیدی خۆم خڕکردەوە کیژەکەم لەباوەش کرد و لۆی دەرپەڕیم.

غەریب بە حەپەسانەوە پرسی:

+ باشە باش.... ناوی چییە ناو؟

بەگم بە تەوسەوە سەیرێکی غەریبی کرد و گوتی:

_ سەبری... ناوی سەبرییە.

ئەمجارە غەریب بە مەغزاوە سەیری دایکی کرد، دەستی گرت و ماچی کرد، ئینجا درکاندنی:

+ کچێ بەگم ئەمن ئەو سەبرییەم زۆر کەتیتە بەر دری، ئەمە غەریب و بێکەسین، ئەویش بێکەس و لێقەومایە چ دەرێی ئەگەر لۆ منی بخوازی.

بەگم کەمێک داما... سەیرێکی غەریبی کرد بینی زۆر بە کولافەوە قسان دەکات، دەستێکی بەسەریدا هێنا و گوتی:

_ بەخوای کوڕم ئەمنیش کەتیتە بەر درم، بەس سەبرەکی بگرین باشە... بزانین هەستان و دانیشتنی کوە، دەحەوێتەوە... ناحەوێتەوە، ئەگەر زانیمان حاڵ و ساڵە هەینێ ناوی خوای لێدەینین.

***

غەریب، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مەیلی مەی خواردنەوەی بەلا دەنا و زیاتر هۆگری دەوام و پاسەوانییەکەی خۆی بوو، لەناو ماڵ و بارەگای شوکریش هەر باس باسی غەریب و ئەو ژنەی بوو کە هەر یەکەو بەجۆرێک لێکی دەدایەوە و باسیان دەکرد.
لە تەیراوەش، سەرەتا سیرۆ هەستی کرد غەریب وەک جاران نەماوە، پاشان جەبارە قەڵەویش هەمان هەستی لەلا دروست بوو، پێیان عاجباتی بوو، چۆن دەبێت غەریب ئێواران نەخواتەوە و شەوانیش بێ کێشە و بێ شەڕ لە حەسارێ دەمینێتەوە و هیچ دەنگێک نەکات... سیرۆ لە دەرفەتێک خۆی گەیاندە بەگمی دایکی و لێیپرسی:
+ پلە بەگم... غەریب چی لێقەومایە وەکی جاران نەمایە... نە دەخواتەوە... نە تاقیبمان دەکات... خۆ نەخۆش نییە.
بەگم بە زەردەخەنەوە گوتی:
_ وەڵڵا سیرۆ چت لێبشارمەوە، غەریبی برات عاشقە... عەشقی ژنەکییە ئاگای لەخۆی نەمایە.
کامۆ حەمامچیش هەستی کرد، غەریب ئێواران لانادات و نایێتە حەمامێ و بیستیتی کە خواردنەوەشی تەرک کردووە، لە دەرفەتێکدا خۆی گەیاندە غەریب و لێیپرسی چت لێقەومایە؟
غەریبیش کامۆی خۆش دەوێ، ورد و درشتی مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە و ئینجا گوتی:
_ کامۆی برام هەنووکەش بەتەمامە مارەی بکەم و بیکەمە بووک و بیهینمە دووڕ حەسارێ.. ئەوجا چ دەبی با ببی.
کامۆ دەستێکی لەسەر شانی دانا و گوتی:

+ غەریب لۆ خوات پێدەرێم، هەندەک ئاقریە، ئەوە ئیشەکی خەتەر و پڕ ترسە... بە کورتییەکەی ئەوە گووی گەمان نییە.

***

تەنیا یەک هەفتە غەریب توانی خۆی ڕاگرێت و لەسەر قسەی دایکی کە گوتی با بزانین چی دەبێت، نەخێر ئارامی لێ هەڵگیرا و بەگمی هەراسان کرد کە دەبێت ئەو ئیشە دوا نەخات، بەگم لە دەرفەتێکدا لەگەڵ هاوسەری شوکری قسەی کرد و مەسەلەکەی تێگەیاند، خاتوونیش شوکری بەگیر هێنا و ڕازیی کرد کە ڕێگر نەبێت، ئیدی هەر لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا سەبری قایلکراو مەلا هێنراو مارەیان کرد و تەدارەکی بووک گواستنەوە ئامادەکرا.

ئێوارەیێک، بە کەچە لادەیێک بووک لە گەڕەکی ئیسکانەوە گواسترایەوە گەڕەکی تەیراوە بۆ ناو حەساریٚ... هەرکە تاریک داهات، غەریب بە بووکەخانی گوت:

_ سەبری ... برۆ ژۆریٚ، قاتە جلکەکی کوردی ڕەشم لۆ بەڕادان دای لەبەریکە، ئەمنیش ئەو ڕانکو چوغەرە سپیەیی لەبەردەکەم... بە عەکسی هەموو بووک و زاوایەکانی ئەو زەمانەی، بووک چووە ژوورەوە قەدە کراسی ڕەش بپۆشی، غەریب دەستێکی لەسەر شانی دایکی دانا و گوتی:

_ دایە... هەتا دەریٚ دەچم... هەوکە دێمەوە.

بەگم زانی مەسەلە چییە، ئەوەندەی گوت مەڕۆ.. کوڕم مەڕۆ، با ئەوشەویش ئەوهابی.

غەریب گوێی لێ ڕانەگرت و دەربەڕی.

بەپەلە خۆی گەیاندە مەشرووبفرۆشەکەی ژێر سەنابل، لەوی نیو قاپ عەرەق و زەرفێک لوقمی پەیداکرد و هەر بەدەم ڕێگاوە تا گەیشتەوە حەساریٚ نیو قاپەکەی هوڵقوڕاند و لوقمەکانی حەپەلووش کرد، کە گەیشتەوە ناو حەساریٚ و چووەوە ژووری خۆیان، بەگم و بووک بەیەکەوە

خەوتبوون و منداڵەکەش دەتگوت فریشتەیە نوستووە... غەریب هەرکە ئەو دیمەنەی بینی لەسەرخۆ گوتی:

_ ئەیهاوار هەیش....ئەوشۆمان فت!!

***

قەدەر عەیامێکی خایاند هەتا سەبری و غەریب شارەزای یەکتربوون و لەگەڵ یەک گونجان، ڕۆژانە بووکەخان لەماڵێ دەمایەوە، بەئیش و کار و چێشت لێنان و ئاگەداری کچە تاقانەکەی سەرقاڵ دەبوو، بەگم دەچووە حەمامێ و خەریکی ژنان دەبوو یان لە ماڵی شوکر لە دیوی ژنان سەرپەرشتی ناندین و ئیش وکاری ژنانی دەکرد، غەریبیش ئەگەر دەوامی هەبووایە، ئەوە دەچووە گەڕەکی ئیسکان و ئەرکی سەرشانی بە ڕێکوپێکی جێبەجی دەکرد، کە دەشهاتەوە ئەوە لەگەڵ کچە تاقانەکەی دەکەوتە یاریکردن، کچەکە زۆر هۆگری غەریب بووبوو، هەموو دەمێ لە باوەشی بوو، ئیدی ژیانیان بەم شێوەیە بەڕێدەکرد و ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵیان بەسەر دەبرد، هەر چەندە جارجارە بە تایبەتی لە کاتی بەدمەستیی غەریب، دەبووە شەڕیان و بەگم هەوڵی ناوبژی و ئاشتبوونەوەیانی دەدا، لەو ماوەیەدا بە نەداری و کولەمەرگی و جارجارەش بە تێروپڕی دەیانگوزەراند و دوو کۆرپەی تریشیان هێنا دونیا، واتە کچێک و دوو کوڕ، بەگم دونیایێک کەیفی بە نەوەکانی دەهات، کە لە حەمام دەهاتەوە ماندوو و مردوو ئەوە خەریکی ئەو سێ منداڵە دەبوو دەیلاواندنەوە، سەبریش مەیلی کەس و کار و دەرەوەی حەسارێ بەتەواوی دانا و حەسار و غەریب و بەگم و هەرسێ منداڵەکەی هەموو دونیای ئەو بوون، بە پارەی ناتری بەگم و بە مووچەی جاشایەتی غەریب توانییان ناوماڵێکی جوان و ڕێک و پێک لەدوو ژووری حەساری قیت بکەنەوە، بەم دوا دواییەش دانیشتووانی حەسارەکە وردە وردە ئەوێیان جێدەهێشت، دەچوون خانووی قاپی باغڵەمەیان بەکرێ دەگرت، تا لەم هەموو خێزان و ژن و پیاو و منداڵەی حەسارنشین، ماڵی پلە بەگم لە دوو ژوور و ماڵی کەریم هەلهەلەی کە دوو ژووریان بۆ خۆیان بەرانبەر ماڵی غەریب و

بەگم گل دابۆوە... ئیتر بەڕۆژ سەرقاڵی ئیش و کاروکاسبی، شەوانیش لە پانتاییەکدا غەریب و هەلهەلە وەک دوو عاشقە مەی، لێیدا دەنیشتن و تا درەنگانی شەو دەمیان تەڕ دەکرد و سەیری تەلەفزیۆنی کەرکووک و تەمسیلییە کوردییەکانیان دەکرد.

***

لە مەقەڕی شوکری لە ئیسکان، جاشەکان دوو دوو و سێ و سێ، بەنهێنی و پستە پستە و منگە منگ باسی کارەساتی هەڵەبجە و کیمیاباران و شەهیدبوونی خەڵکی شارەیان دەکرد، غەریب تەقەی سەری دەهات و خۆی لێنەبان دەکرد، چونکە زەبر و زەنگی زاڵمەکانی بەعس و دایەرەی ئەمنی بینی بوو نەیدەویست جارێکیدی تووشی کێشە و زیندان بێتەوە، بۆیە خوا خوای بوو زوو بە زوو ئەرکی تەواو بێت و بگەڕێتەوە حەساریّ و شەوێ عارەق و لوقمی سوور و کەریم هەلهەلەی لە کیس نەچێت، پاشتر جاشە باشەکان باسی ئەنفال و مەرگەساتی ئەو گوندانە و داڕووخان و هەرەسی شۆڕشیان دەکرد و بە نهێنی ئاخیان هەڵدەکێشا و بە دزی فرمێسکیان بۆ ئەو خەڵکە لێقەوماوە و بۆ پێشمەرگە و شۆڕش هەڵدەڕشت،کەچی غەریب حەز و مەیلی بۆ ئەم قسەو باسانە نەبوو، چرکە و سەعاتی دەژمارد بگاتەوە حەسار و عارەق و لوقم و هەلهەلە و تەمسیلی ڕەجەبی پاقلەخۆر و درەنگانی شەویش ئەگەر تاقەتی بوو فیشەگێک بتەقێنێ و سەبری لەخۆی ڕازی بکات.

بەم شێوەیە ژیانی غەریب بەردەوام بوو، تا ئەو ڕۆژەی بە بڕیاری دیکتاتۆر ڕژێمی بەعس هێرشی کرد و وڵاتی کوێتی داگیرکرد و خەڵکەکەی پەراگەندەکرد، لە هەینێوە غەریب لێقەوما لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان لە مەقەڕ و لەلای شوکر ئەرکی زیاتر بوو پتر لە واجب دەمایەوە و بەچەندین شەو نەیدەتوانی بگەڕێتەوە تەیراوە و حەسار و عارەق و لوقم و هەلهەل و باوەشی گەرمی سەبری، دووەمیان ڕۆژ بەڕۆژ جگەرە و عەرەق و مەی بە گشتی لە کەمییان دەدا و گران دەبوون.

دیکتاتۆر لەسەر ملهوڕیی خۆی لە کوێت بەردەوام بوو و نەکشایەوە و کردییە پارێزگایێکی عێراق، هاوپەیمانان تەنگیان پێ هەڵچنی و

تەنگاوییان کرد، داوای پاشەکشەیان لێکرد، ئەوییش سەری لێ شێوا و سواری سەری خۆی بوو کەللەڕەقیی نواند و پشت ئەستوور بەو هەموو سوپایە و گاردی کۆماری و جەیشی شەعبی و فیدایییەکانی و جبەخانە زەبەلاحەکەی، چەقی و لە کوێت مایەوە، تا لە پڕ ئاگروئاسنی هاوپەیمانانی بەسەردا باری و کەس نەبووە برای کەس، کونە مشکیان لە دیکتاتۆر کردە قەیسەری، ئەو سوپا پڕ چەکە وەک مۆم توایەوە، کوێت ئازادکرا و پاشماوەی سوپا شەق و شرەکەی گەڕانەوە و یەکەمین بلێسەی ڕاپەڕین لە باشووری عێراق لەلایەن سەربازە بەزیوەکانەوە بووە سەرهەڵدان و پرۆشکەکەی زۆربەی شارەکانی خوارووی گرتەوە.

لە هەولێریش ڕۆژ بە ڕۆژ ژیان و گوزەرانی خەڵکەکە ناجۆر و خراپتر دەبوو، غەریب لە ئەرک و فەرمانەکانی جاشایەتی وەڕس و بێزار بوو بوو، تا ڕۆژێکیان جلکە سەربازییەکەی داکەند و لە ژووی پاسەوانان لەگەڵ تفەنگ و تاخمەکەی بەجیهێشت و بە شەڕواڵ و کراسێکی ڕەش لە مەقەڕ دەرپەڕی، بڕیاریدا جارێکیدی نەگەڕێتەوە... لە هەینێوە کەم شەو لە حەساریێ دەمایەوە، یان لە ماڵی سیرۆ یاخود لەماڵی جەبارە قەڵەو دەمایەوە، بە ڕۆژیش چەند قوومە عارەقێکی فەلی پەیدا دەکرد و سەری خۆی پێ گەرم دەکرد.

خەڵک لە هەولێر لە چاوەڕوانیدا بوون، هەموو پەشۆکاو و هەستیان بۆ بەرپابوونی ڕووداوێکی گرنگ ڕاگرتبوو، داروەدەستەی دەسەڵات و حکوومەت لەناو شار لاواز بوو بوون، ئەو سام و زەبر و زەنگەی جارانیان نەمابوو، وەک سەگی هار بە ترومبێل بەناو شاردا دەسوڕانەوە، ئەوانیش چاوەڕوانی ڕووداوێکی نە قۆڵایان دەکرد، قات و قڕی شمەک و خواردنی وشکە و گرانبوونی بازاڕ ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی دەسەند.

ڕۆژێکیان، لەبەردەم چایخانەی کرێکاران و لەناو جەرگەی بازاڕ، کۆمەڵێک خەڵکی چاوکراوە و شۆڕشگێڕ کردیانە هەڵڵا و وێنەی دیکتاتۆریان دڕاند و هوتافیان لێداو کردیانە خۆپیشاندان و ناو بازاڕ پشێوی تێکەوت، وردە وردە خۆپیشاندانەکە پەرەی سەند و خەڵک تێکەڵی بژی بمرییەکە دەبوو، بەڵام پیاوە گرگنەکانی دەسەڵات زوو بەزووبە زەبری ئاگر و ئاسن بڵاوومیان بە خەڵکەکە کرد و خۆپیشاندانەکەیان کوژاندەوە.

ڕۆژێ پاشتر، لە تەیراوە لە نزیک تەجنید ژمارەیێک گەنج گردبوونەوە و دەستیان بە هوتاف لێدان کرد و هاوارییان دەکرد بڕوخێ بەعسی و بمرێ سەدامی دیکتاتۆر، پاشان هەڵمەتی دڕاندنی وێنەی سەدامی سەر دوکانەکانیان دەست پێ کرد، تا تڕومبێلی نەجدە و ئەمنەکان گەیشتن، ئەوان زۆربەی وێنەکانی دیکتاتۆریان دڕاند و خستیانە ژێر پێیان... بە هاتنی هێزەکانی دەسەڵات پەرتەیان لێکرد و لەبەر چاوان بزر بوون.

بەڵام خەڵکەکە، هەولێرییە جوامێرەکان چاوییان کرایەوە و ترسیان شکاو ئامادەبوون بە گژ ئەو ئاگر و ئاسنەدا بچنەوە کە پیاوانی ئەمن و ئیستیخبارات و جاشە ئەڵقە لە گوێیەکان لە دژیان بەکار دەهێنان..

شەوانە گوێیان لە ئێستگەی پێشمەرگە دەگرت و پتر جۆشیان دەسەند، هەر لە ئێستگەوە بیستیان ڕانیە ڕاپەڕی و ئازادکرا و بووە دەروازەی ڕاپەڕین، هێندەی نەبرد خەڵکی قارەمانی سلێمانی ڕاپەڕین و بەدوو ڕۆژ دام و دەزگای دەسەڵاتیان تەخت کرد و شاری سلێمانییان ئازاد کرد.

لە هەولێر، دڵەڕاوکێ و ترس و لەرز بەسەر پیاوە بوودەڵەکانی بەعس و دەسەڵات زاڵبوو و بەتەواوی لاواز ببوون، شەوی (٣/١٠) غەریب، لەماڵی جەبارە قەڵەوی بوو، هەستی کرد دەنگێک لە بڵندگۆوە دێت، لەگەڵ

جەبار چوونە سەربان و بەتەواوی جادەی تەیراوەیان لێ دیار بوو، ترومبێلێکی نەجدەی پۆلیس هێدی هێدی لە جادەکە بەرەو لای گازینۆ عەنتەری شۆڕ دەبۆوە، لە بڵندگۆکەیەوە ئاگەداری دەخوێندرایەوە، دەنگەکە بە لەرزۆکی دەیگوت: ( لەسەر فەرمانی عەلی حەسەن مەجید وەزیری ناوخۆ، سبەینێ (٣/١١) لەسەرجەم پارێزگای هەولێر هاتوچوو قەدەغەیە، داواتان لێ دەکەین کەس لە ماڵی خۆی نەیەتە دەرەوە، هەرکەسێک لەماڵ دەرچێت خۆی بەرپرسیار دەبێت)

نەجدەکە وردە وردە شۆڕدەبۆوە، بە نهێنی و بە پەلەش لەسەری کۆڵانەکانی تەیراوە بەرد بارانی پۆلیس و ترومبێلیان دەکرد، غەریب بڕیاریدا بگەڕێتەوە لای سەبری و منداڵەکان و بەگمی دایکی، جەبارە قەڵەو زۆر هەوڵیدا بمێنێتەوە و نەڕوا، دواجار غەریب دەرگای حەوشەی کردەوە و ئاوڕی لە جەبار دایەوە گوتی:

_ بەسەری داکم دەڕۆم، کێ چوزانی سبەینێ چ دەقەومێ!... لەکن سەبری و مندارەکان و داکم نەبم حەیا و شەرەفم دەچی.

لێیدا ڕۆیی و خۆی گەیاندەوە حەساری.

***

سـبەینەی (١٩٩١/٣/١١) تازە گزنگ کەوتبوو، دوور بە دووری دەنگی تەقە و گرم وهۆڕی تۆپ دەبیسـترا.. غەریب چونکە شـەو هیچی لێنەدابوو، زووبەزوو لە خەو ڕابوو، سـەیری کرد هێشـتا بەگمی دایکی و منداڵەکان لەشـیرین خەودان، هەسـتا و جلکی گۆڕی و لە حەسـارێ دەرپەڕی، هەستی کرد شار ئاسایی نییە، دەوروبەری دەنگی تەقەی دێ و ژن و پیاو و منداڵ لە ماڵ هاتوونەتە دەرەوە و لەسـەرە کۆڵانەکان گردبوونەتەوە، ئیدی هەوراز بووەوە بۆ سـەری کۆڵانی لای تەجنیدی کۆن، لەوێ ژمارەیێک گەنج بەیەکەوە وەسـتابوون، غەریب هەموویانی دەناسـی، دەنگی تەقە و هات و هاواریش هەروا زیاد دەبێت و نزیک دەبێتەوە، لە خوارەوەی کۆڵانەکەرا گەنجیکی خڕپن و چوست و چالاک خۆی بەسـتبوو، تفەنگ بەدەسـت لەگەڵ چەند گەنجێک هەورازبوونەوە، گەنجە چوسـتەکەی ناسـییەوە، نەبەزی کەریم کێشـکە بوو، نەبەز هاتە پێش و نزیک لە قەرەباڵغییەکەی سەری کۆڵانێ، تفەنگەکەی بە یەک دەست بەرزکردەوە و هاواری کرد:

ـ ڕاپەڕینە ڕاپەڕین، هەولێر ڕاپەڕی چـاوەڕێی چ دەکەن... قەزای هەولێر ئازادکرا و پۆلیسـەکان هەراتن و چەکەکانیشـیان تەسـلیم بە خەڵکی کرد... فەرموون با ئێمەش بەرەو دایەرەی ئەمنی هەولێر بچین، لەوێ تەقەیە با زوو ئازادی بکەین.

نەبەز و گەنجەکانی لەگەڵی ڕۆیشـتن، خەڵکەکانی دیکەش لەگەڵ غەریبی بەگەڵیان کەوتن، ئیدی بە هوتاف لێدان و بەو پەڕی جۆش و خرۆشەوە بەرەو دایەرەی ئەمنی هەولێر شۆڕبوونەوە.

تەقە گەرم بوو، هات و هاواری خەڵکی و حەماسـی جەماوەری ڕاپەڕیو لە پەرەسـەندن دابوو، لەو کاتەدا لەناو دایەرەی ئەمنەوە گوللە هاوەن هەڵدەدرایە ناو شار و هەر جارەو بەبەر شوێنێک دەکەوت.

لە حەسارێش بەگم لەخەو ڕابوو بوو، لە حەوشە هەستی ڕاگرتبوو بزانێ چ باسە، زانیشی غەریب لە ماڵێ نەماوە و ڕۆیشتووە، چووە بەر دەرگای حەسارێ تا بزانی غەریب لەوێیە یان نا، گەیشتە نزیک دەرگا و گوللە هاوەنێک بەر دیواری تەنیشـتی کەوت و پارچە ئاسـنێک ڕێک بەبەر هەناوی کەوت و لە ئەرزەکەی تەخت کرد... بەهۆی دەنگ و تەپ و تۆز و دووکەڵ خەڵکی کۆڵان، بە هەڵەداوان لە حەسـاری وەربوون و گەیشـتنە سـەر لاشـەی لەخوێن وەردراوی بەگم... خەڵکەکە زوو بەزوو زانییان کە بەگم، دەمودەسـت بە گوللە هاوەنەکە گیانی سـپاردووە و شەهید بووە.

***

ئەم بەیانییە، شارخرۆشابوو، هەولێرییەکان بەیەکەوە یەکدەست و یەک دڵ ڕاپەڕینو لەماوەی چەند کاتژمێرێک سەرجەم دام و دەزگاکانی حکوومەتی بەعسیان لەشار خاپوور کرد، هەموو ئەمانە بەخوێنی گەشی شێرە ژن خەجە باوە و مامۆستا بەهرام و کاکە موحسینی وەستا یاسین جامچی و جەمال عەبدوڵلا و دایە بەگمی غەریبۆکە و چەندین شەهیدی دی هاتنەدی.

بەرەبەری نیوەڕۆ غەریبۆکەیان ئاگەدارکردەوە بگاتەوە حەساریَ کارەساتێک قەوماوە، کە هاتەوە هەر لە پێش دەرگاکە چاوی بە حەشاماتی خەڵکەکە کەوت دڵی خورپەی کرد و چۆکی لەرزی... هەرکە گەیشتە ناو حەساریَ زانیی چ کارەساتێک قەوماوە و چۆن غەریبتر بووە... ما لەسەرو پۆتەڵاکی بدات خۆی بەسەر تەرمی پیرۆزی بەگمی هاوسەری شەهید عەتەوڵلای تەیراوەیی دا بدا و لە بابە ڕۆ و دایە ڕۆ بدات... هەردوو کوڕ و کچەکەشی خۆیان بەسەر تەرمی نەنکیاندا دا و لەگەڵ باوکیان دەگریان. خەڵکەکەی عاجباتیان بە سەبری دەهات لە دیار ئەم مەرگەساتە ڕاوەستابوو و نەدەجوڵا و نەشدەگریا، هەرکە هەستی کرد خەڵکەکە تەمەشای دەکەن و پێیان سەیرە کە وەک غەریب و منداڵەکانی ناگری و شیوەن ناکات، بۆیە بە دەنگێکی پڕ لە هەنسکەوە گوتی:

+ جەرگم لۆ دایە بەگمی ژانیَ دەکا... بەس ئەمن لە گریانیَ بێزاربوومە و ناتانم چیدی بگریێم.

تەیراوەییەکان هەروان، لەکاتی لێقەومان و بەهانا هاتن هەموو براو پشتی یەکترن، ئیدی زوو بەزوو ئاو گەرم کرا، دادە بەهیە و دادە زلێخ و پلکە

ڕەحمەتە تەرمەکەیان شوشت و کفنیان کرد و ئامادەیان کرد بۆ بەخاک سپاردن.

غەریب بڕیاریدا دایکی شەهیدی لە گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشیدی بەخاک بسپێرێ، ئیدی جەنازەی بەگمی شەهیدی و ژنە شەهید ئامادەکراو خرایە سەر شانان، تەیراوەییەکان شەهیدی خۆیان بە بێنازی بەڕێ ناکەن، نەخوازەڵڵا جەنازەکە شەهید بوویێت، بۆیە لەکاتی بەڕێکردنی تەرمی دایە بەگمی غەریبۆکەی، لە حەسارێڕا بەرەو گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشید، هەموو تەیراوەییە بەوەفاکان بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە شان بە شانی (غەریبۆکەکەی) برایان لێنەگەڕان دایە بەگم بە بێنازی و بێکەسی بەڕێکرێ و سڵاوی ماڵئاوایی لێنەکەن، جگە لە مامۆستا مەلا جەرجیس و مەلا هیندۆ و عارەب عوسمان و کەریم دەشتی و جەوهەرکەریم و عوبێد مەجید و سدیق و سەعیدی شەهید مەلا یاسین زراری و هەردوو عەبدوڵڵا گوێ بە گوارەکەی تەیراوە، گوێ بە گوارە پرێمزچییەکە و گوێ بەگوارە دەروێش و شوفێرەکە، ڕەمزی و فەوزی و کەژادی معاون ساڵحی و دڵشادی سابیر سەماوەر و ئەسعەد عەدۆ و عوسمان عەدۆ، لەتیف و نازمی حەمەساڵح کارەباچی، ئەنوەر فڕنیچی خدر سمێر سۆر، سیرۆی مەجیدە خێلی و جەبارە قەڵەو و جەعفەر و ئەنوەرە کۆری برای، حاجی فازیڵ و موەفەق و زەکەریای مام کاکۆی خەیات، مام حاجی تەهای دۆڵدرمە، شوان و سیروانی مام وسووی کەبابچی، عەبدولعەزیز و عەبدولوەهابی برادەری و حەسەن یاسین و قاسم شێروانی و غازی غەفور و هیتۆ غەفور و بەختیار شەعبی و تەحسین هەرشەمی و مەجید هەرشەمی و ئازاد و نەبەزی کەریم کێشکەی، محەمەد زادەی خەتات، مام فاروق چایەچی و کوڕەکانی، سەنگەر و

سەرهەنگی حەسەن گەردی، شێرزاد عەبدولڕەحمان و حەیدەر عەبدولڕەحمان و ئەمیر و جەمیل و جەگۆی مام ئەنوەری نانەوا، ڕەشادی مام حوسێنی شەلاع، سەلاح و نەهرۆ و حەمەزیادی سەلیم سەیدۆکی، مام شێرۆ و کامەرا حەمامچی و سەباح پیرپاڵ و سیروان و محەمەد عوسمان و ئەنوەر عەزیز و ئازاد و نەوزاد حەویز کۆیی و شێرۆ حەلیم و نەوزاد مەلەوانی و مستۆ کۆر و سابیر سارۆخ و برایەکەی و شێرزاد و بەرزۆ و جیهانگیر گەردی، توفیق و شێروانی مام عومەر پەڕەشوتی و عەونی قەساب و ڕەمزی سەوزەفرۆش و زاهیر و مەعروف و عەبدولقادر و عارفی حاجی عەبدوڵڵا گوێ بەگوارەی، ڕەشیدی مام کەریمە گڕەی، نوری و عارەبی مام مەولوودی و وەلید مەعروف و ڕزگارخۆشناو و ڕەنجبەر خۆشناو و لوقمان بەرزنجی و سەعدوڵڵا پەرۆش و ئەبوبەکر مەلا ئیسماعیل نانەکەلی و نوری نانەکەلی و ڕەمۆ و ئیسۆ و مەمۆی خەلیفە سەعۆی و زیاد ئەسعەد و هاوتای برای و بورهانی مام ڕەسوڵ پاقلاوەچی و سابیرە سۆری بلباس و مەغدید و عەلی و قانعی برای، شێروان و سالمی عەبدوڵڵا گەمشۆی و نەریمان محەمەدی تۆپانێ و سدیق و نامیق و ڕەفیقی پلە ڕەحمەتەی. هەموو بەچاوی فرمێسک و بە دڵی خەمبار لەدوای تەرمی پیرۆزی شەهید (دایە بەگمی) غەریبۆکەی بوون بەرەو سەر قەبران، لەوێ دەست و برد تەرمەکە تەسلیم بە خاکی پیرۆزی تەیراوە و کوردستان کرا، مەلا تەلقینی خوێند، فاتیحا لێدرا، ئێستا دەبێت غەریبۆکە قسان بکات، شتێک بڵێ دەرهەق بە ماندووبوون و وەفای تەیراوییە بەوەفاکان، ئیدی هەندێک ڕاڕابوون کە غەریب نازانی قسان بکا، هەندێکیدی دەیانگوت غەریب هێشتا بەرینەدایە و مەستە، قسەی چی بکا؟ لەو کاتەدا شوێنەکەی غەریب کەمێک بەرز بوو، هاتە

خوارەوە ڕێـک چووە ســـەر گۆڕی دایە بەگم و بەنـاڵە و فیغـانەوە تێیهەڵکرد:
( دایە بەگم... کچێ خانمی خانمان، ڕووناکی ماڵەکەی من، ئەی گەوهەر و ســولّتانی من، ئەی پاکترین عەشــقی من، کیژێ جوانترین گوڵی من، پشتت شکاندم بەگم، جارێ زوو بوو بەگم....کچێ لۆ ماری خۆت لەگەر کردم بەگم ... بەبێ توو کوو بژیم بەگم!... هەی هەموو ژیانم بەگم) لەگەڵ گریانی تەیراوەییان ئەویش تێر تێر گریا.... ئینجا سەری بەرزکردەوە و گوتی:
برایانم ... تەیراوەییە بەوەفا و جوامێر و دڵســۆزەکانم، بەناوی خۆم و بەناوی شــەهید بەگمی هاوســەری شــەهید عەتاوڵڵای تەیراوەیی، زۆر مەمنونتانم، خودا خێرتان بنووســی.... یا ڕەبی دووربن لە قەزاو بەرای دونیایێ، هاتنتان و بەشــداریتان لەگەرە من جێگەی ســەربرندی و پیاوەتییە... خوای گەورە لە برایەتیتان کەم نەکات و بە مەردی بتانبینم.

# 6

هەر لەناو حەوشە گەورەکەی حەسارێ، سێ ڕۆژ بەشەوەکەیەوە پرسە بۆ بەگم دانرا، غەریب ئەو سێ شەو و ڕۆژە بەم هەموو خەڵکە، بەم هەموو تەیراوەییە لە ژن و پیاو سەرسام بوو، قەت نەیدەزانی بەگمی دایکی بەمجۆرە لەلای هەمووان خۆشەویست بوو، غەریب بەخۆی و بە سەبریی هاوسەری زۆر دڵخۆشبوون بەو حەشاماتەی لە ڕۆژانی پرسە و سەرەخۆشی و دڵدانەوە، ڕوویان لە حەسارێ دەکرد، هەموو خۆیان بە خاوەن پرسەکە دەزانی و هاوبەشی خەمەکەیان بوون.

لە دڵەوە غەریب ڕۆژانی پرسە لەسەر ئاو و ئاگر بوو، خوا خوای بوو قەرەباڵغییەکە زوو کۆتایی پێ بێت و بتوانێت لە خەفەتی ئەم کارەساتە و لەداخی لەدەستدانی بەگمە جوانەکەی شەو و ڕۆژ ڕوو لەمەی بکاتەوە و تەواو مەست بێت و ئاگای لەم دونیا بێوەفایە نەمێنێ.

سێ ڕۆژەی پرسە تەواو بوو، ڕۆژانی پاش ڕاپەڕین ڕۆژە بێ ئاو بێ کارەباکان بوون، بێسەروبەریی ناو شاری گرتبووەوە، کەس بەکەس نەبوو، دزی و تاڵانی و سووتاندنی هەندێک لە باڵەخانەی دایەرەکان دەستی پێکرد، کەلوپەلی سووک و بەردەستیان دەبرد و ئەوانەشی کە هەڵنەدەگیران و قورس و نەقۆڵا بوون دەشکێنرا و دەسووتێنران، دڵسۆزە بەژمارە کەمەکانیش هەرکە دەیانگوت:

+ کاکە لۆ دەیشکێنن... لۆ دەیسوتێنن، ئاخر ئەوانە موڵکی گشتین.

کەچی هێزە ئاڕئاڕەکە فشەیان پێدەهات و ئەوەی پێیان بردرا بردیان و ئەوانیدیشیان یان شکاند یان سووتاند.

غەریب پاش سێ ڕۆژەکە، یەکەمین ئیش کە ئەنجامی دا، چووە ژوورەکەیان و ئەو باوڵە بە قفل و کلیلەی بەگمی دەرهێنا و بردییە ژوورێکی چۆڵی ناو حەساریّ و لە بنەبانیّ حەشاری دا و پارچە جاجمێکی بەسەردادا و دەرگای ژوورەکەشی ڕەپێش کرد، لەم بگرە و بەردەیەی گواستنەوەی باوڵەکەی دایکی، سەبری لە حەساریّ نەبوو چووبوو لە بازاڕی تەیراوەی تەماتە و خەیار و پەتاتە بکریت بۆ خواردنی ئێوارە.

غەریب بە تەواوی متووی خواردنەوە و دەمتەڕکردن و سەرخۆشی بوو، بە ڕۆژ دەیخواردەوە و بەشەویّ لەبەردەرگای حەساریّ دادەنیشت و شیوەنی بۆ دایە بەگم دەگێڕا.

ڕۆژێک سیرۆ هات و پێی گوت:

+ ئەتو نارێی حەمەجەزا برادەرمە و لە سجن پێکەوە بووین؟ دەفەرموو ئەوە هاتتەوە، سبەینیّ لە نادی حەفلەی هەیە، وەرە با بچین بزانین کوو برادەرتە؟

بۆ سبەینیّ پاش نیوەڕۆ بەناو بازاڕیدا هەڵکشان و چوونە بەردەم یانەی مامۆستایان، دەرەوە و ژوورەوەی یانە جمەی دەهات لە خەڵک، سەربان و بن بان قەرەباڵغ بوو، ئەوانیش غەریب و سیرۆ لە لایێکی باخچەکە دوور بەدووری ڕاوەستان و چاوەڕوانی دەستپێکردنی ئاهەنگەکە بوون، زۆر قەرەباڵغ بوو چەکدار لە بێچەک پتر بوون، کاتی دەستپێکردنی هات و تیپی مۆسیقا چوونە سەر شانۆ و دامەزران، ئینجا کوڕێکی باریکەڵەی لەڕولاوازی شاڵ لەبەر سەرکەوت و کەوتە پێشکەشکردن، غەریب بە سیرۆی گوت:



+ ئۆی، ئەو کوڕەی دەناسین، ئەوە ماڵیان لەپشت حەساری مەیە، کوڕی مام حاجی عەبدوڵڵای خدر سمێر سۆرییە، ئەها لە تەمسیلان پێیدەڵێن ئۆمەرە گەدەی چاوچنۆک.

ئیتر حەمە جەزا بە جلک و بەرگە جوانەکەی بەدەرکەوت و چووە سەر شانۆ، مۆسیقا دەستی پێ کرد، سەدای چەپڵە و هەلهەلەی جەماوەر بۆ خۆشەویستی هونەرمەندە لەمێژینە نەدیتووەکەیان بەرز بووەوە، حەمەجەزای بە ویقارِ دەنگی هەڵبڕی و گۆرانیی خوێند، غەریب جووڵەی پێکەوت و هەوڵیدا لە شانۆکە نزیک بێتەوە بەڵکوو حەمە جەزا ببینێ، حەمەجەزا بەردەوام بوو، غەریبیش ڕووبەڕوو بەرامبەری ڕاوەستا و بەدەست ئاماژەی بۆ دەکرد بەڵکوو سەرنجی بکەوێتە سەرو کاکە حەمە بیبینێ، بەزمەکە درێژەی کێشا، حەمەجەزا بەردەوام بوو، جەماوەریش پتر لەجۆشوخرۆشدا بوون.

لە پڕ یەکێک دەستی خستە سەر شانی غەریب و گوتی:

+ کاکۆ ماندی نەبی .... کووی باشی؟

غەریب ئاوڕی لێداوە یەکسەر ناسییەوە، ئەوە ئەو کاک عەبدوڵڵا مەخموورییە بوو کە حەمەجەزا لە زیندانەوە بە غەریب ڕاسپاردەی بۆ نارد.

غەریب بە دڵخۆشییەوە گوتی:

_ ئای بە قوربانتبم... زۆر باشم، کاکە کوو بگەمە ئەو برادەرەم و دوو قسەی لەگەر بکەم؟

مەخموری گوتی:

+ عەجەلەت نەبی، دەبینی چەند قەرەباڵغ و هۆسە و هەرایە، سەبرەکت هەبی با حەفلەکە تەواو بیت، بەخۆم دەتبەمە کنی.

ئیـدی چـاوەڕێیـان کرد، حەمەجەزا بەردەوام بوو لەگەڵ جەمـاوەرە تێنووەکەی، بەر لەوەی ئاهەنگەکە کۆتایی بێت بەهۆی زۆری خەڵک و پاڵەپەستۆی جەماوەر، بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر شۆستە و شەقامی بەر دەرگـای یـانەکە خڕبوویوونەوە، بووە خەپسـەـ، هەرا گەورە بوو لەلایەن ئاسایشەکانەوە تەقەکرا، شیرازەی ئاهەنگەکە تێکچوو، کەس نەبووە برای کەس، پشـێوی ڕوویدا، پەرتەی لێکرا، سـیرۆ و غەریب بەناو بازاڕیڕا گەڕانەوە تەیراوە، لەلای سینەما سیروان، سـیرۆ دوو سـەندویچی کڕی، یەکێک بۆ غەریب و ئەوەکەی خۆشـی هەر لە ڕێگا بەبەر قەمپاڵانیدا، کەچی غەریب دەمی لێنەدا تا گەیشـتنەوە لای ماڵێ، بەلای مزگەوتی کوێتیـدا تێپەڕبوون، لەبەردەم و لەنـاو مزگەوت کۆمەڵێک سـەربازی سوپای عێراقییان بینی کە بێکەس و داماو چاوەڕێی چارەنووسی خۆیان دەکرد، غەریب گەیشتە لای سەربازێک، لەڕوولاواز و تێکشکاو، دڵی بۆ سـووتا، یەکسـەر بابۆڵەکەی دەسـتی پێشـکەشـکرد، سـەربازەکەش بە نوزەیەکەوە گوتی:

ـ ڕەحمەڵە والدێک



ئیدی ڕۆژ بە ڕۆژ شـــار ڕووداوی ســـەیری بەخۆوە دەبینی... هەندێک خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگەنامە نەســــووتاوەکانی دایەرەی ئەمن بوون، هەشـــبوو بەدوای ئازیزانی ئەم زیندان و ئەو زیندانی دەکرد، دەبیســـترا زیندانی ژێر زەوی هەیە، شـــۆفەڵیان هێنا و زەوی دادڕی، لەم ســـەرەوە هاواریان دەکرد لەو ســـەرە هەمان دەنگ دەزرینگایەوە... چەند ڕەفیقێک لە هۆڵی میدیا بەچەکەوە خۆیان حەشاردابوو، هاوڕێیانی حیزبی شیوعی کە بەرانبەر هۆڵەکە بوون و لێیان هاتنە دەســـت و قیڕەبڕیان کردن، چەند ڕۆژێک لە گۆڕســـــتانەکانی پیرداود و مەعمەل قیر، خەڵک خەریکی گۆڕە غەریبەکان بوون. تا کەسوکاریان بناسنەوە و کێڵێی شایستەیان بۆ قیت بکەنەوە، پاشـتر لە پڕ دەنگۆی هاتنەوەی سوپای بەعس بڵاوبووەوە، دوو قەمەرە لە جێگەی جیاجیا هاوەنیان دەتەقاند و شـــــاری هەولێریان هەراســــانکرد، لە پڕ هەردوو تڕومبێل گیران و ئەم ترس و دڵەڕاوکێیەش ڕەوییەوە، شـــار هێور بووەوە... خەڵک ســـەرتاپا چەکداربوو... غەریبیش کلاشـــــینکۆفێکی یەکلاقی پەیدا کردبوو پتر کەیفی پێدەهات وەک ئەوەی جاشایەتییەکەی نەبوو.

دواجار دەنگۆی هاتنەوەی عەســـــکەر و حکوومەت بڵاوبووەوە، هەموو دەیانگوت دەبێت لە قوشـــــتەپە بەرگری بکەین و نەهێڵین جەیش بگاتەوە هەولێر.. هێز بەڕێکرا... غەریب خۆی بەســـت و کلاشـــینکۆفی لەشـــان کرد و خۆی لە قوشـــــتەپەی دیتەوە، کەچی هێزەکەی حکوومەت بە زرێپۆش و دەبابە و کۆپتەرەوە زۆر نابەرامبەر بوو، غەریب و برادەرەکانی بە پەرە پڕ ڕزگاریان بوو خۆیان گەیاندەوە ناو شـــــاری. لەناو شـــــاریش دەنگۆی گەیشتنی حکوومەت و عەسکەر گەرمتر بوو، هەر بابا بوو، بە تڕومبێلەک، بە عارەبانە و بە پاســـکیل و ماتۆڕ و بەپێیان بەرەو ڕێگای

کۆیە و شــەقڵاوە، خۆیان دەرباز دەکرد، هەموو زەندەقیان لە تۆڵە و زەبر و زەنگی بەعس چوو بوو نەیاندەویست بکەونە بەردەستیان.

غەریب و سەبری بڕیاریاندا حەسار و تەیراوە و هەولێر بەجێ نەهێڵن، چی دەبێت با ببێت، غەریب لەناو یەکێک لە ژوورەکان چاڵێکی گەورەی هەڵکەند تا لەکاتی پێویــــت خۆی تیادا بشــارێتەوە، هەرکە دەیبیســـت قەوەت هات یەکســـەر دەچووە ناو چاڵەکە هەرچی دۆشـــەک و بەتانی هەبوو بەسەرخۆی دادەدا و خۆی دەمراند.

بارودۆخ هەروابوو، بەرەبەیانێک هێزێکی ســـــەربازی زەبەلاح بە کۆڵانی ســـەروخوارێی حەســـارێ وەربوون تاک تاکە خەڵکەکە لەبەر دەرگا و ناو کۆڵان گردبوونەوە، لە پڕ ئەفســـەرێکی پلەدار لەناو تانکێک هاتە دەرەوە و سەیرێکی خەڵکەکەی ناو کۆڵانێی کرد و گوتی:

+ کێ لەنگۆ ڕەفیق حیزبی و بەعسی بوو.. بابێتە بەردەمم.

کەس نەجوولا... بێدەنگییێکی ترســـــناک باڵی بەســــەر کۆڵان و پێش حەسارێدا کێشا... وەڵام نەبوو، کەچی ئەفسەرە پلەدارەکە گوتی:

+ ئەمن ســـوپاســـتان دەکەم کە کەســـتان بەعســـی نین، کەس عێراقی تێکنەدا حیزبی بەعس نەبێت.

ئیتر بەعس و ڕەفیقەکان و هەتا ســـەرکردایەتی و خودی دیکتاتۆری تێر جنێوکرد و گوتی:

+ هەتا ئێمە لێرە بین... ئێوە ئازادن... بەکەیفی خۆتان هاتوچوو بکەن.



شـــار نیمچە چۆڵ بوو، ئەوەی دەبیندرا تەنیا ســـەربازەکان و جارجارەش پیاوانی ئەمن بە جلکی مەدەنی و لەناو ترومبێلەکان لەسەر شەقامەکان تیژ تێپەڕ دەبوون، ڕۆژانی دواتر وردە وردە ژیان ئاسایی بووەوە، دوکانەکان کرانەوە و کاسبکارەکان ترسی دزی و تاڵانی دوکانەکانیان نەما، بازاڕ تۆزێک گەرموگوڕی بەخۆیەوە بینی، وەک ڕۆژانی سەرەتای هاتنەوەی ڕژێم نەما کە عارەبەکانی مووسڵ و شەرگات و تکریت بەلۆری بوزیان دەهێنا و بە قیمەتێکی گران دەیانفرۆشـــت، هەروەها بەنزین بە دوو قاتی نرخی خۆی بوو، جگە لە تەماتە و پەتاتە و پیاز. ئیتر وا دوکانەکان کرانەوە و جموجۆڵ بەناو بازاڕ کەوتەوە، ئەوانەی لە شـــارەکانیدیش شمەکیان دەهێنا، هەرزانتر لە جاران دەیانفرۆشت، غەریب زۆر بێتاقەت و کز و مەلوول دەبینرا، ئاخر ئارەق و ڕەحەتە لوقمەســـووری بەدەســـت نەدەکەوت، خۆ ئەگەر دەستیشی کەوتبا بە نرخێکی گرانتر بوو، بە هەزار حاڵیش جگەرەی دەست دەکەوت، بە تەواوی لەم ژیانە وەڕەس و بێزار بوو. لە ڕێکەوتی (١٩٩١/٤/٢٠) بە فەرمی مونزیر نەقشـــبەنـدی کرایە پارێزگاری هەولێر و لە باڵەخانەی پارێزگا دەســـت بەکاربوو، دەنگۆ وا بڵاوبۆوە، کە هاوکاری خەڵکی هەژار و بێکار و کەمدەرامەت دەکات و دایاندەمەزرێنێ. بە تەگبیر و پرس و ڕا لەگەڵ سەبری، غەریب هاتە سەر ئەو بڕیارەی بچێت وەک ئەو خەڵکە داوای یارمەتی و ئیشـــێک لە پارێزگاری تازە بکات، دواجار بە سەبریی گوت:

+ ها ژنێ... ئەتوو چ دەڵێی بچم یان نەچم؟

سەبری دەمودەست وەڵامی داوە:

ـ بڕۆ پیاوەکە بڕۆ، ئەمە بەخۆمان قەیناکە با بمرین لە برســـان، بەران ئەمە سێ مندارمان هەیە، کاروکاسبییەکی نەکەی بە هیلاک دەچین.

بڕیاردرا و ڕۆژی دواتر خۆی گەیانده پارێزگا و لەگەڵ ژمارەیێک خەڵکیدی ناوی خۆی نووسی... پاش چاوەڕوانییێکی زۆر هەموو بردرانە هۆڵێکی فراوان، ئەوان دانیشتن و پارێزگار بە جلک و بەرگی سەربازی لێیان بەژوورکەوت و بە کوردی بەخێرهاتنی کردن و چوو لە بنەبانێ دانیشت، بەر دەستەکەی دەفتەرێکی خستە بەردەمی، ئەویش بە دەفتەرەکەوە خەریک بوو.

پارێزگار سەری بەرزکردەوە و سەیرێکی میوانەکانی کرد و ویستی دەست بە قسەکردن بکات، لە پڕ سەربازەکەی نووسینگەی هاتە ژوورەوە و سەلامێکی بۆ کرد و گوتی:

+ گەورەم.... ئەو پیاوە هاتووە دەڵێ، ( پارچە کاغەزێکی بچووکی خستە بەردەم پارێزگار) دەڵێ ئەمن نووسەرم.

پارێزگار پارچە کاغەزەکەی بەردەمی خوێندەوە و گوتی:

_ ئۆ... بابێت با بێت... یەکسەر با بێتە ژوورێ، لۆ ڕاتگرتییە.

سەربازەکە چووە دەرەوە یەکسەر نووسەرەکە بەژوورکەوت و لەگەڵ پارێزگار کەوتنە ماچ و موچی یەکتر و لەتەک یەکتر دانیشتن و کەوتنە گفتوگۆ. خەڵکەکەش کەوتنە پستەپست و دوو دوو لەگەڵ یەکتر دەدوان، لەناو ئەم هەراوهۆریایە، غەریب گوێی لێبوو، نووسەرەکە بە خەمبارییەوە بە پارێزگاری گوت:

+ ئاگات لێیە ئەو بێقیمەتانە چیان لەو شارە جوانەمان کرد، ئەوەی دزییان دزییان، ئەوەی سووتاندیان سووتاندیان. پارێزگاریش سەری بۆ دەلەقاند، غەریب بەم قسانەی کابرای نووسەر سەرودڵی گیرا و یەکسەر هەڵساو بەپەلە هۆڵەکەی بەجێهێشت و لەبەر خۆیەوە گوتی:

ـ سندان لەو ئیشەش بدات، نامەوێ بە واستەی ئەو گەوادانە بە دەستم بکەوی.

*** 

لەبێ پارەیی و لە بێ ئیشی ڕۆژ بەڕۆژ غەریب بێزارتر دەبوو، شەوێک لەگەڵ سەبری و منداڵەکانی دانیشتبوون، کەس قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، سەبری وەڕس و داهیزراو، غەریب مرومۆچ خەریکی جگەرەکێشان بوو، بیری لە بێکەسی خۆیان و نەمانی بەگمی دایکی و بێ پارە و دەرامەتی دەکردەوە و هەر ئاخی هەڵدەکێشا... لە پڕ بیرێک بە مێشکیدا هات، بەڵام بێدەنگ بوو تا منداڵەکان بە برسیەتی بۆ خەو پاڵکەوتن، ئینجا سەبری هەڵساند و بردییە حەوشەی حەسارێ و بە تەگبیر پێیگوت:

+ ژنێ باشم گوێ لێ بگرە... ئەمە ئەگەر شتەکی نەکەین، بەخۆمان و منداەکان قوڕبەسەر دەبین.

سەبری هەڵیدایێ:

ـ ئێ وەیە، بەس چ بکەین؟ چمان لەدەست دێ؟

غەریب یەکسەر قسەکەی قۆزتەوە:

+ ئەو حەسارە گەورە و گرانە، ئەو هەموو ژۆرە بەتارە...ئەو حەوشە گەورەیە... دەبی لەمەودوا ئیستفادەی لێبکەین.

سەبری بە سەربادانەوە:

ـ کوو ئیستفادەی لێبکەین، چیان لێبکەین؟

غەریب گوتی:

+ ئاهە... گێ بدێ... با منداەکان بە تەواوی بنوون، ئەوجا دێینەوە حەوشێ، هەینێ دەست بەکار دەبین، جارێ قسان مەکە.

ئیدی چاوەڕێ بوون هەتا هەر سێ منداڵەکانیان خەوتن، ئینجا بە ئەسپایی لە ژووری چوونە دەرەوە، لە ناوەڕاستی حەوشە لەلای بنەبانێ غەریب وەک ئەندازیارێکی مەعلان ئەمسەر و ئەوسەری کرد و بۆی دانیشت و سەیرێکی زەوییەکەی بەردەمی کرد و هەڵسایەوە ڕووی لە سەبری کرد:

+ گێ بدێ سەبۆ، لێرە بە درێژی قەبرێک هەڵدەکەنین، ئەوجا خۆڵەکەی بەسەردا دەدەینەوە و دوو بلۆکیش دەکەینە دوو کێل و بەدارێکی درێژیش ئەو پارچە پەڕۆیەیی ناو باڵی داکم کە بە عارەبی ئایەتی لێنووسرایە هەڵدەدەین، لە سبەینێوە بڕۆ لە کۆڵانان بگەڕێ و بڵێ قەبری پیاوچاکەکی لەناو حەساری هەیە، لۆ زگ و زاری ژنان و لۆ بەخت کردنەوە و لۆ خۆ خۆشەویست کردنێ لەکن مێردەکانتان یەکا و یەکە... باشە وەدەکەی؟

سەبری بەدڵخۆشییەوە گوتی:

_ وەڵڵاهی ئیشەکی پوختە، لە سبەینێوە وەدەکەم... ئەدی چ لەو ژوورە بە تاڵانە دەکەی؟

غەریب گوتی:

+ سبەینێ دەچم دە دەستە وەرەقەی قوماری دەکڕم... لە هەر ژوورەکی دەستەکی دادەنێم و دەیکەمە قومارخانەی تەیراوە، ئەوان قوماری بکەن و ئەمەش ئیستۆکی وەردەگرین و زەنگین دەبین.

دەمودەست بە بێڵ و قازمە کەوتنە هەڵکەندنی گۆڕێکی دوور و درێژ بەر لە تەواوبوون غەریب چوو لەناویدا پاڵکەوت ئینجا هەندێکیدیش درێژیان کردەوە، کە تەواوبوون بە پوختی خۆڵیان بەسەردا دایەوە و خۆڵی پتریشیان لە دەرەوە هێنا و قەبرێکی درێژ و سامناکیان دروستکرد، ئینجا

دوو بلۆکیشـــیان لە ســـەرینایی و پێنگایی بە قیتی دانا، غەریب بەپەلە چووە ژوورەوە و پارچە قوماشە سەوزەکەی لە باوڵی دایکی دەرهێنا و بە دارێکی بەســـتەوە و لە ســـەرینایی گۆڕەکەی چەقاند، ئیدی ســـەبری گۆڕەکەی ئاوڕشـــین کرد و جوان جوان پەســـتییەوە و دەوروبەرەکەی گسکدا و خاوێنی کردەوە، هەرکەسێک بیدیتبا دەیگوت نەک ئەمشەو ئەوە سەد ساڵە ئێرە گۆڕی پیاوچاکێکە و پێویستە زیارەت بکرێت.

ئیدی سبەینێ زوو بەزوو، سەبری هەرسێ منداڵەکەی بەگەر خۆیدا و بەناو کۆڵانەکانی تەیراوەی کەوت بۆ پڕوپاگەندە و قایلکردنی ژنان تا بێن سەردانی گۆڕی پیاوچاکەکەی ناو حەسارێ بکەن، غەریبیش چوو دە دەستەی لە وەرەقەی قومار کڕی هێنایەوە ماڵێ، لە ڕێگاش دەگەیشتە هەر برادەرێکی پێی ڕادەگەیاند کە لەمەودوا لە حەســـارێ بە شـــەوان قوماری دەکەین.. ئەوەی دێ بە چاوان ئەمە بە خواردن و چایەیی گەرم لە خزمەتدا دەبین. کە ســـەبریش لە هەڵمەتی پروپاگەندە گەڕایەوە بە یەکەوە لەگەڵ غەریب ڕێککەوتن کە پارەی ژنە زیارەتکارەکان بۆ سەبری بێت و یەک دیناریشی لە غەریب حەڕام بێت، پارەو ئیستۆکی قومارەکەش هەمووی بۆ غەریب بێت و فلسێکی ئەحمەڕیش لە سەبری حەڕام بێت. ئینجا غەریب مەرجێکی خستە بەردەم سەبری و گوتی:

+ ژنەکە.... بەخۆت دەزانی قومار پاش تاریکی و بەشەوان دەکرێ... ڕەنگە تا درەنگی شەوێ لێرەبن و قوماران بکەن، خۆ ئەگەر برسییان بوو دەبێ ئەتوو خواردنیان لۆ حازر بکەی... وەبی زوو هەرنەســـتن و قومار بەردەوام بێت و ئەمەش پارەی زیاترمان بێتە دەست.

سەبری یەکسەر ڕازی بوو گوتی:

ـ هەر ئەوەندە بەسەرچاو، چ زۆرە هێلکە زۆرە، نانی تیریش هیچ منەتی تێدا نییە.

لەم تەگبیرانەدا بوون، دوو ژنی عەبا بەسەر بەژوورکەوتن و هەڵکشانە بنەبانێ و چوونە سەر گۆڕەکە و خۆیان پێدادا و کەوتنە ماچکردنی پەڕۆیە هەڵواسراوەکە... عەیامێک مانەوە و دوعا و نزا و پاڕانەوە و فرمێسکیان تێر تێر هەڵوەراند، پاشان هەستان و سەبریش چوو بەرایی لێگرتن، ئەوانیش بەجیا هەر یەکە و سەفتەیێک پارەیان خستە مستی سەبری و پاڕانەوە:

ـ خوا خێرتان بنووسی.... تخوا دوعای خێرمان لۆ بکەن با مرازمان حاسڵ بی.

ئەوان ڕۆیشتن، سەبری و غەریب خەنی بوون و پارەکەیان ژمارد و سەبری بڕێک پارەی لە مستی غەریب ناو گۆتی:

+ هەستە برۆ... یەک تەبەقە هێلکە و دوو کیلۆ پەتاتە و دوو کیلۆ تەماتە و کیلۆیەک پیازی بکڕە... زوو وەرەوە لە چ جێیان خۆت نەگنخێنی.

غەریب دڵنیابوو هەر شەوی یەکەم هیچ نەبیت هەشت کەس لە برادەرە قومارچییەکانی پەیدا دەبن، بەسەر دوو ژوور دابەشیان دەکات و قومار گەرم دەبیت، ئیستۆکیش کەم و زۆر هەر دەبێت.

ئەو ڕۆژ بازاڕی سەبری گەرم بوو، هەر ژن بوون دەستە دەستە دەهاتن و خۆیان لە خرتۆری سەرگۆڕەکە وەردەدا، کە دەڕۆیشتن شتێک پارەیان لە دەستی سەبری دەنا... ئێوارەکەی غەریب ڕاڕابوو لە هاتن و نەهاتنی قومارچییان... منداڵەکانیش لە حەوشە هاروهاجیان دەکرد، غەریبیش

لەتـاوان خۆی لیَ تووڕە دەکردن و لێیـانی ڕادەخوڕی کە دانیشـــن و بێدەنگ بن.
تاریک داهات، لە هێکڕا دەنگی دەرگای حەســاریَ هات... یەکێکیش گوتی:
_ مارەکە، لەمارێن؟... ڕووخسەت هەیە بێینە ژۆریَ؟
غەریب دەنگەکەی ناسییەوە یەکسەر ڕاپەڕی و هاواری کرد:
+ فەرموون... فەرموون کاک یاسین یاخوە بەخێربێن.
یاســـین و ســـیَ برادەری بە ژوورکەوتن و غەریبیش ژووری قومار و دانیشـتنی پێشـاندان و چوونە ژوورەوە... ئیدی ئەوان دامەزران و دەسـتیان پێکرد، وەجبەیێکیدی لە دەرگایان دا و بەژوور کەوتن و چوونە هۆدەیێکی ئەولاتر و قومـار دامەزرا... غەریبیش نـاوە نـاوە ســـەردانی دەکردن و هەندێک لەلایان دەمایەوە، ئەوانیش دەیانزانی مەبەسـتی چییە، شـتێک پارەیان لە حەوزەکە هەڵدەگرت و وەک ئیســـتۆک دەیاندایێ. درەنگی شـــەوێش هێلکە و ڕوون بە نانی تیری و تەماتەی قاشـــکراو گەدەی هەمووانی پڕ کرد و سوپاسگوزار بوون.
وای لێهات ژوور بەبەر نەدەکەوت لەبەر قومارچیان، ئەوان قوماریان دەکرد و غەریبیش ســـووک ســـووک مەســـەی لە عەرەق دەدا و وەردەگەڕا لوقمەسۆری گیرفانی و زوو زووش لەسەر قومارچیان دەگەڕا و ئیستۆکی وەردەگرت و هەردوو باغەری شەروالی پڕ لە پارە دەکرد، دەیخواردەوە و لە ژوورەکان دەگەڕا، ســـەبریش پاش ئەوەی منداڵەکانی تێر دەکرد، ئینجا خەریکی دروستکردنی خواردن دەبوو بۆ قومارچییەکان، هەرکە ژوورەکان چۆڵ دەبوون و تەنها ژوورێک دەمانەوە و و درەنگ هەڵدەســـتان، غەریب دەچوو لەویَ بەشداری قوماری دەکرد، سەرخۆش و مەست، قومار گەرم

دەبوو... ئەو پـارەیەی لە ئێوارێوە لە گیرفـانی نـابوو، لەوێ بە قومـار هەمووی دەدۆڕاند و مایەپووچ هەڵدەسـتاوە و هەرکە حەسـار چۆڵ دەبوو لە قومارچییەکان، ئینجا لەسـەر دۆڕاندن و گیرفان بەتاڵی غەریب، لەگەڵ سەبری دەبووە شەڕییان و هات و هاوار تا درەنگانی شەو درێژەی دەکێشـا، بەم شـێوەیە عەیامێکی زۆر خانەوادەی غەریب... بە زیارەتی ژنان بۆ سەرگۆڕە وەهمییەکە و بە قومارە گەرمەکەی شەوان، گوزەرانیان باش باش بوو.



ڕۆژێکیان، لەبەیانییەوە هەتا ئێواریٚ تاریک دشـــهات ژنێک نەهاتە زیارەتی گۆڕەکە و سـەبری بازاڕی کز بوو، بۆیە مڕومۆچ دانیشـتبوو ئـاگری دەکردەوە، غەریب هەسـتی پێکرد کە ژنەکەی ئەمڕۆ هیچ دەسـتکەوتێکی نەبووە، ئیدی بێدەنگ بوو تا قومارچییەکانی هەموو ژوورەکان خڕبوونەوە، ئەو شەوە سەید عەبدولقادریش هاتبوو.

بەر لەوەی بچنە ژوورەکانیان غەریب هەموویانی کۆکردەوە، بەخۆشـی چووە سەر بەردێکی بەرز و هەڵیدایێ:

+ برادەران بەخێر بێن، برایان ئەمە، مەخسەدم ئەمن و سـەبری ژنم زۆر مـاندی و هیلاکین، بەهیچ شـتەکی ڕانـاگەین... بەتـایبەتی خاوێنکردنەوەی پیسـی و پاشـەڕۆتان، لەبەر هەندێ هیچ عێدز مەبن، بڕیارماندایە هەرکەسـێک بیەوێ دەسـت بەئاو بگەینێ و خۆی خاڵی بکات دوو ڕێی لەپێشە یان دەبی بچیتە مزگەفتی کوێتی لەوێ دانیشی و دەست بە ئاو بگەینی... یان لێرە لە ئەدەبخانەی مە، لێرەش هەرکەسێک چوو، دەبی پێشـەکی یەک دینـار دانێ ئەوجـا بچیتە ژوورەوە، قومارچییەکان هەموو ڕازی بوون ئیدی هەرکەسە چووەوە ژووری خۆی، هەینێ سەید عەبدولقادر خۆی گەیاندە غەریب و چرپاندییە گوێی:

+ چاوت دەخۆم، بڕیارەکی پیاوانەت دا، ئەو قەشـمەرانە وا دەزانن عالەم خوڵامی بابیانە دەبی خزمەتیان بکەن.

هەر سەید عەبدولقادر وەرسوڕاوە ژوورێکیان و بە قومارچییەکانی گوت:

+ وەڵڵاهی عەیبە لەو قەشمەرەی قبووڵ بکەن، وا دەزانی توالێتی شیرین پڵاسی دانایە، لۆ گووکردنێ داوای پارەی دەکا، ئاخ! چبکەم ئەمن هەر بێزم نایێ لەو خەلایە پیسـە دانیشـم، دەچمە مزگەوتێ.... دەنا دەمزانی کوو جوابم دەداوە !

هەرکە ئەم قسە و ئەم دووڕووییە بەغەریب گەیشتەوە، یەکسەر سەید عەبدولقادی بانگکرد و عەلەمی شکاند:

_ سەیدە فشە ... لەمەودوا نەک لۆ گووکردن، لۆ گووخواردنێش قبوڵ ناکەم بێیە ئێرە... پێت لە حەساریَ باوێی، پێت دەبڕمەوە.

هەرکە سەید سەری شۆڕکرد و ڕۆیی، غەریب لەسەرە خۆ گوتی: دە چەغە بە.

****

ساڵ ڕۆیی، ساڵ هات... سەبری ماندوو مردوو، جگە لە خزمەتکردنی ماڵ و منداڵ، خواردن دروستکردن بۆ خۆیان و بۆ قومارچییان و پاک ڕاگرتنی دەورووبەری گۆڕەکە، غەریبیش بەردەوام، پارەی گووکردنی قومارچییان و ئیستۆکی قوماری وەردەگرت و ئارەقی هەڵدەقوڕاند و تەنها مەزەش لوقمە سوورە شیرینەکە بوو، پاشترێش درەنگی شەو گیرفانە پڕ لە پارەکانی بە سەرخۆشی و لە قوماركردن بەتاڵ دەکرایەوە.
ئیدی ئەوە بووە پیشەیان، ژنان دەستە دەستە دەهاتنە سەر گۆڕی پیاوچاکەکە و پارەیان لە دووڕ دەستی سەبری دەنا، قومارچییەکانیش لە ئیستۆک بەخشین بە زیادەوە بەردەوام بوون، چونکە دەیانزانی درەنگانی شەو پاش فوول مەستبوونی غەریب مگێزی قوماری دەبزوێ و لە قومارێکی فێڵاوی چی خڕ کردۆتەوە هەمووی لێوەردەگرنەوە.
بەم شێوەیە ژیانە عەجایبەکەی غەریب و سەبری و منداڵەکانی دەگوزەرا. تا سێ ڕۆژان، سەبری خەونی ناخۆشی بۆ غەریب ئاشکرا نەکرد، سێیەمین ڕۆژ بوو، منداڵەکان داوای لەفەی فەلافلیان لە باوکیان کرد، ئەویش دەستی منداڵەکانی گرت و بە پێشە خۆیدان، بەر لە دەرچوون ئاوڕێکی لە سەبری دایەوە و گوتی:
+ حەزت لە چییە؟ دوو لەفەی فەلافلیش لۆ توو بینم؟
سەبری بە ئەوکی پڕ لە گریانەوە گوتی:
ــ درم چ نابا...برسیمە و هیچم پێ ناخورێ.. ئەوە سێ شەوە خەونی ناخۆش و جرنا و فرنا دەبینم... وەختە درم بتەقی، برۆ لەفەی لۆ مندارەکان بکرە... وەکی هاتییەوە خەونەکەمت لۆ دەگێڕمەوە.
غەریب و منداڵەکان چوونە جادە و ناو بازاڕی تەیراوە هەتا بە دڵی خۆیان لەفە بخۆن و سکیان پڕ کەن.

لەهەمان کات، ترومبێلێکی بەرزی ڕەشــی پڕ لە چەکدار، بە دەمامک لەبەر دەرگای حەسار ڕاوەستا و چەکدارەکان هاتنە خوارێ و لە حەسارێ بەژوور کەوتن، هێندەی نەبرد دووانیان قۆڵی ســـەبریان گرتبوو هێنایانە دەرەوە و خســـتیانە ناو ترومبێلەکە، لە هیکڕا ترومبێلەکە بە تەناش دەرچوو و تۆز و خۆڵی بەسەر ئەو کەسانەدا باراند کە بە دیار ڕووداوەکە حەپەسابوون.

هێشـــتا قەرەباڵغی خەڵکەکە مابوو، کە غەریب و منداڵەکان لە خواردنی لەفەی فەلافل گەڕانەوە، غەریب هەرکە چاوی بە قەرەباڵغیەکەی پێش دەرگای حەســارێ کەوت، دڵی خورپەی کرد، کە چوونە پێش و قسـەی خەڵکەکەی گوێ لێبوو، زانی کار لە کار ترازا، تازە سەبریەکەی خۆیی و منداڵەکانی و بەگمی دایکی و گۆڕەکەی ناو حەسار و قومارچییەکان با بردی و لەکیسیان چوو.

کارەســـــاتەکە گەورە بوو، نە غەریب ئاگای لە منداڵەکانی ما نە منداڵەکان بەبێ دایکیان دەحەوانەوە، گریان و داد و فیغانیان بەردی دەتاواندەوە، غەریب بەڕۆژ لەملا و لەولا دەگەڕا و دەگریا و ســـۆراغی ســـەبری دەکرد و هیچی بەدەســـت نەدەکەوت... بەشـــەوانیش هانای بۆ عەرەق دەبرد و بە قەپارلێدانی لوقمە ســوور و بە گریان و دەســت لەملانێ لەگەڵ منداڵەکانی ژیانی بەســەر برد، تا خێرخوازێک ئامۆژگاریی کرد و پێی ڕاگەیاند کە منداڵەکانی بباتە خانەی بێسەرپەرشتان... تا لەوێ پەروەردە بکرێن و لەدەست نەچن و لە برسان نەمرن... غەریب قسـەکەی بە هەند وەرگرت و منداڵەکانی برد و لەوێ بەجێی هێشتن.

غەریب بە ڕۆژ لە ســۆراغی ژنەکەیدا بوو، بە شـــەوانیش لە حەســـارێ لەسەر قومارکردن و خواردنەوە بەردەوام بوو، دەستکەوتی لە ئیستۆک و

له زیارەتی گۆڕی پیاوچاکە،کە بەشـــی ســـەبری بوو هەمووی خڕ دەکردەوە و درەنگانی شەو لە دەرچەیێک هەمووی دەدۆڕاند.

***

چەنـدان ڕۆژ غەریـب گەڕا، لە هەولێرێ، لە هەموو جێیەک گەڕا و پرســـی: ئەرێ ســـەبریتـان نەدیتییە، دەوروبەری قەڵاو منـارەی کرد، قەیسـەری دوکان بە دوکانی پرسـی و هیچی لێهەڵنەکڕاند، چووە دەرێ، بەرزاییەکانی کەســـنەزان، لە تاک بەتاکی ســـەرخۆشـەکانی پرســـی و هیچی دەسـتنەکەوت، بۆ لای گردجووتیار و بەحرکە و گردعارەق هەرەتە بوو، ماندوو بوو، هیلاک بوو، هیچی دەســــتنەکەوت، ئەمجارە کوڕانی تەیراوە لەگەڵ غەریبی برایان شانبەشان زۆر گەڕان، ئاقاری بنەسراوەی، دەشـــتەکانی دارەتوو، زورگەکانی گێمەدێ، هەر شــوێنێکیان بە خەیاڵدا هات گەڕان کەچی سەرەداوەکیان دەستنەکەوت.

غەریـب لەگەڕان بێ هیوا بوو، دەســــتی لەخۆبەردا، کەوتە خواردنەوە، عەرەق و مەزەی ڕەحەتە لوقم... لوقمی ســـوور و عەرەقی فەل... ئێوارەیێکیان لەســەرخۆشـێکی بیسـت... کە لە نزیک باخچەی کورد و عەرەب لە تەیراوەی ئاهەنگی بووک گواســـتنەوە هەیە، فەرهاد زیرەک لەوێ گۆرانی دەڵێت... دەمودەســـت غەریب خۆی تەواو مەســـت کرد و چووە ئەوماڵەی کە ئەگلەنجەکەی لێدەکرا، بەژوورکەوت، لەم کاتەشـدا فەرهاد زیرەک بە دەنگە زەمین لەرزێنەکەی چریکاندی:

لەهەرکێ بی یادت دەکەم

لەهەرکێ بی بیرت دەکەم

ئەو جێگایەی تۆی لێنەبێ بەسەر

خۆمی کاول دەکەم.

غەریب، لەپەناییێک بەڵام دڵ پڕ و قورگ پڕ لە گریان گیرسـایەوە و چاوە کزەکانی لە فەرهاد بڕی فەرهادیش پتر دەنگی هەڵێنا:

دەڕۆم ئەم شارە جێدێڵم

چیدی جێم لێنابێتەوە

لە هەر کوچە و شەقامێکی

یادی تۆم بەبیر دێتەوە

بەهەشتیش گەر تۆی لێنەبی

چۆن دڵم پێی دەکرێتەوە.

غەریب لە هاڕەی گریانیدا، بە چەپەڵۆکان کەوتە لێدانی سـەری خۆی و بەدەنگ دەگریا، فەرهادیش پتر دەنگی هەڵبڕی و چریکاندی:

دەڕۆم ئەم شارە جێدێڵم

چیدی دڵم لێینابێتەوە

لە هەر کوچە و شەقامێکی

یادی تۆم بەبیر دێنیتەوە.

بەهەشتیش گەر تۆی لێنەبی

چۆن دڵم پێی دەکرێتەوە.

ئامادەبووانی ئەگلەنجەکە لە چەپڵەلێدان بوون، غەریب لە هاڕەی گریان و قوڕبەسـەری و بێکەسـی خۆیدا و خۆی گەیاندە فەرهاد زیرەک، دەسـتی لە ملی کرد و تێر تێر بۆنی کرد و ماچی کرد و بەگریانەوە پێیگوت:

+ فەرهاد... ئەمن و ئەتوو... هەردووکمان قوڕبەسـەرین، فەوتاین... فەوتاین.

هەینێ، ماسـتاوچییەکان هەردوو باڵی غەریبیان لە ملی فەرهاد زیرەک کردەوە و دوور دووریان خستەوە و گوتیان:

+ ئەم کوڕە بەدمەستە واز لە فەرهادی نایێنی.
پیلی غەریبیان گرت و فڕێیاندا دەرەوە، لەم کاتەدا ســـیرۆی برادەری گەیشــتە ســەری پێیراگەیاند: لە ئاقاری پیرزینی لە نزیک گردەبۆری، تەرمی ژنێک دۆزرایتەوە، سبەینێ دەچین بزانین سەبریە یان نا.
بۆ بەیانی، کوڕانی تەیراوە، دڵسۆزانی غەریب و سەبری بە دوو ترومبێل چوون، گەڕان، زۆر گەڕان... ســیرۆ ڕێنیشــاندەر و چاوســاغ بوو، لە ناکامدا تەرمی ژنێکی شــێوێنراویان دۆزییەوە... هێندەیان شــێواندبوو، ڕووخساری نەدەناسرایەوە... جگە لە فیشەک لێدان، بە تایەی ترومبێلیش بەسەر لاشەو کەللەسەریدا چووبوون. شێواندبوویان بەڵام غەریب دواجار بە جلک و بەرگەکەی سەبرییەکەی خۆی ناسییەوە و بە گریانەوە گوتی:
+ هەوە... ئەو ژنە شــێوێندراوە ... ئەو ژنە قوربەســەرکراوە... ئەو ژنە ناشــرین کراوە، ژنە شــیرینەکەی منە، ئەوە ســەبرییەکەی منە... ئەوە داکی منداڵە بێنازەکانی منە.
تەرمی شێوێنداری سەبری هێنرایەوە حەسارێ.. لەسەر تەرمەکە غەریب بۆ خۆیی و بۆ ســەبری و بۆ بێکەســیی خۆیان گریا و شــیوەنی کرد، برادەرەکانیشــی لە مشــووری شــۆردن و بەخاکســپاردنی تەرمەکە بوون، بانگی یا ســەبیحە کۆیی کرا، جوان جوان تەرمی شێوێندراوی ســەبریی شــووشــت و کفنی کرد، تەیراوەییەکان لە حەســارێ خڕبوونەوە، هەموو وایـانـدەزانی غەدر لەوانکراوە... غەرد لە کیژوکوڕێکی بە ئەمەک و بەوەفای ئەوان کراوە.
تەرمیان خستە سەرشان و بەرەو گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشیدی، لەتەک گۆڕی دایە بەگم ســەبریی خێر لەخۆنەدیویان بەخاک ســپارد، هەموو دەگریان و شــیوەنیان دەکرد، تەیراوەییەکان تێکڕا بۆ ئەو مەرگە نەتکراوە

دەگریان، غەریب لە هەمووان بەکوڵتر دەگریا و قوڕی دەپێوا، چوو لەتەنیش گۆڕی سەبری ڕاوەستا و پێی لە عەرزەکە چەقاند و هاواری کرد:

+ هۆ برا و برادەرە تەیراوەییەکانم، ئەمنیش زۆرم نەمایە و سەگتۆپ دەبم، بەڵام با وەسیەت بێ، ئۆباڵم بە ملتان ئەگەر مردم لێرە لەمابەینی سەبرییەکەی خۆم و دایە بەگمە هیلاک وماندییەکەم قەبرم لۆ لێدەن و لێرەش بمشارنەوە.

کە هەموو شتێک تەواو بوو، هەفتە و مانگ بەسەر ئەم کارەساتە ڕەت بوو، قومار لە حەسارێ بەردەوام بوو، هەر خڕکردنەوەی ئیستۆکی قومارچییان بوو، هەر دۆڕاندنی غەریب و لەکیسچوونی پارەکە بوو، ئاخر قومار و سەرخۆشی و لیقەومان کوجا مەرحەبا!

شەوێکیان، پاش چۆلبوونی ژوورەکانیدی و مانەوەی یەک ژوور بە دڵ و ویستی غەریب، ئەو هەردوو باغەر پڕ لە ئیستۆک، بێمنەت چووە بەر قومار، بەڵام سەرخۆش و فول دانتری، قومارکرا، زووبەزوو غەریب دۆڕا، هەر چ پارەی باغەری شەرواڵی بوو هێنرایە دەر، خراپ دۆڕا، ناچار بیری کردەوە چی هەیە؟ بیری بەلای سەلاجەکەیماڵەوەیان چوو، کردیە قومار، سەلاجەکەی ماڵەوەی کردە قومار، کەچی دۆڕاندی، مخابن سەلاجەکەشی دۆڕاند.

کابرای براوە هەستایە سەرپێ و بە دڵخۆشییەوە گوتی:

+ سەلاجەکەت دۆڕاند، هەر سبەینێ دەنێرم سەلاجەکەم لۆ بیبینە بازاڕی و دەیفرۆشمەوە ... تازە ئەتوو دۆڕاندت.

شەوێ کابرای براوە لە شیرین خەویدا، سەبری بەجلک و ڕووخساری خویناوییە دێتە خەونی و هەڕەشەی لێدەکات و پێی دەڵێ: ئەتوو بە چ

هەقێک ئەو سەلاجەیەمان دەبەیە بازاڕی و دەیفرۆشی؟ ئەوە مولکی من و منداڵەکانمە، هی ئێمەیە... هی غەریب نییە!؟ دەستی لێدەی زەرەر دەکەی نەیفرۆشی، تێگەیشتی؟

بۆ سبەینێ کابرای براوەی قومار، بە هەڵەداوان خۆی دەگەیێنێتە غەریب و بە نوزانەوە دەڵێ:

+ کاکە غەریب سەلاجەکەم ناوێ موبارەکی خۆتان بی... بەس لە کۆرم بنەوە و چیدی مێنە خەونم.

***

پاش نەمانی سەبری، غەریب بە تەواوی باری دەروونی تێکچوو، وەک شێت هەڵسوکەوتی دەکرد، هەرکە ژنە زیارەتکارەکان دەهاتنە سەر گۆڕی پیاوچاکەکەی ناو حەساریێ، غەریب لێی لەهەڵا دەدان و بەهات و هاوار دەیگوت:

+ کێهەتان مێردی لێیدایە، کامەتان ئاوس نابن، چ ژنەکتان دەیەوێ مێردەکەی ببیتە گوخۆر و قۆندەرە و موو نەپسێنێ.

بەمشێوەیە وردە وردە ژنە زیارەتکارەکان ڕەوینەوە و کەس ڕووی لە حەساریێ نەدەکرد، شەوانیش لەکاتی قومار، غەریب بەسەر قومارچییەکاندا دەسووڕایەوە و دەستی کەشف دەکردن و وەرەقەی فری دەدا و لایەکی بە دۆڕان دەدا و لایەکەیدی سووک و ڕسوا دەکرد، ئەوها لە قوماری حەساریێ ڕەواجی نەما و ژوورەکان سارد و سڕ و قومارخانە چۆڵ و هۆڵ.... ئینجا غەریب ڕووی لە خواردنەوە کرد و لە ڕادەبەدەر دەیخواردەوە لوقمی دەخوارد و مەست و سەرگەردان، کات و ساتی لێ تێکەڵ بوو، وای لێهات بێزی لە عەرەق و خواردنەوە و هەڵقوڕاندنیش بووەوە، چەند ڕۆژێک، بە بێکەسی و بە تەنیایی لە ژوورەوە لە حەساریێ

لەسەر چاوکەت، شەو و ڕۆژ بە زەحمەت گەر ژەمێکی بخواردبا، هیچ ئاگای لە دونیا و لە دەوروبەر نەما.

ڕۆژێک، لەبەر دەرگای مزگەوتەکەی نزیک حەسار، ئەو بەلادا دەهات و دەچوو و خۆی بۆ ڕانەدەگیرا، سمێڵ هەڵپاچڕاوێکی شەرواڵ کورتی ڕیش درێژ، ڕوویەڕووی وەستا و دەستی خستە سەر شانی:

+ غەریبی برا خوا قوەتتدا.

غەریب، بە حاڵ چاوی هەڵێناو سەری بەرزکردەوە و بە نوزەوە:

_ قەوەتی چ؟ ... چ قەوەت بوو هەموویان برد، هەموویان خوارد، هەموویان کوشت... ئەمن و قەوەت کوجا مەرحەبا.

ڕیش درێژ قۆزتییەوە:

+ نانا... ئەگەر مەیلت لێبی... ئەمە ئیرادە و قەوەت و ژیانت لۆ دەگێڕینەوە... بڕێ لە چت کەمە؟

غەریب:

لە هەموو شتەکم کەمە، لە سەبرییە جوانەکەم... لە منداڕەکانم و لە حەز و ئارەزووەکانیان، لە بەگمی داکم و بەدبەختییەکانی، لەم حەسارە مەملەکەتە گەورەم ...لە.....لە....لە.....

ڕیشدار:

+ وەرە لەگەڵم.. با دڵ و دەروونت ئاوەدان بکەینەوە، با برینەکانت سارێژ بکەین، با ڕووناکی و نووری دونیا و ئاخیرەتت پێشان بدەین.

ئیدی قۆڵی گرت و بردی... چەند ڕۆژێک لەناو ئەو سمێڵ هەڵپاچراو شەرواڵ کورت و ڕدێن درێژانە مایەوە، وەک ئەوان سمێڵی هەڵپاچی و ڕیشی بەردایەوە و شەرواڵی تا گۆزینگی کورت کردەوە، وردە وردە حاڵ و ساڵ دەبوو بەقسەیانی دەکردن و نەرم نەرم خۆی تەسلیم دەکردن...

لەگەڵەوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆ و عەسر و شێوانی دەکرد، لەبەرخۆیەوە هەر ورتە ورتی بوو و نزای دەخوێند، ئەوانیش بە چڕی ئیشـــیان لەســـەر دەکرد و مێشکیان دەشووشتەوە ئامادەیان دەکرد تا لە تەیراوەی مەڵبەندی ژینی خۆی کەتنێکی گەورەی پێبکەن، ئەویش نەرم و نییان چووبووە ژێر باریان و نەخێری نەبوو. دواجار ئامادەیان کرد، پڕ کرا لە قین و لە تۆڵە و لە کوشتن و بڕین، هەینێ تەکلیفیان لێکرد:

_ تۆ لەم ماوەی لەگەڵماندا بووی لەهەموو گوناحەکانت پاک بوویەوە، ئێســـتا دەتوانی بۆ ئارامی گیانی بەگمی دایکت و ســـەبری هاوســـەرت بەیەکجاری پاکی و پاکیزەیی ڕۆحی خۆت، ئەم پشـــتێنە ببەســـتی و لەبەردەم قەرەباڵغی بازاڕی پیرەژنـان لە تەیراوەی دەســـــت بەم دوگمەیە دابنێی و خۆشاوی شەهادەت بنۆشی.

غەریب جەســـــتە و دڵی کەوتە لەرزە، ترســـــا، تەیراوە و بازاڕی پڕ لە شەهامەت و کەسایەتی تەیراوەییانی هاتە بەرچاو، چایخانەی مەلایاسین زراری و کەبابخانەی مام وسوو کەبابچی و دوکانی ئەنوەرە کۆر و نانەوا خانەی مام ڕەسول کلاو لباد و سەرتاشخانەی حەمەدەمین حەلاق و تاهیر چایەچی و خالید مەلا نوعمان و ڕەمزی ســـەوزەچی و عەونی قەســـاب و مەغدید و حوسێن شەلاعی بەبیردا هاتەوە. هەینێ بەهۆشی خۆیدا هاتەوە لێیان پاڕایەوە کە:

+ ســـەبرێکی لێ بگرن... ســـبەینێ ســـەردانی گۆڕی بەگمی دایکی و سەبری خێزانی، هەر سێ منداڵەکانی بکات لە خانەی بێسەرپەرشتان. ئینجا بۆ هەموو کارو چالاکییەک ئامادەیە.

ئەوان ڕەزامەندییـان نوانـد و ئەویش بۆی دەرچوو، هەرکە بۆی دەرچوو دەورووبەری نوێژی عەســـر بوو، بەپەلە خۆی گەیاندەوە حەســـارێ چووە

ژووره تایبەتەکە و جاجمی لەسەر دۆلآبەکەی دایکی لادا و پریاسکەکەی بن جلک و بەرگەکانی بەگمێی دەرهێنا – زارکی پریاسکەکەی کردەوە، جووتێک گوارە و ئەنگوستیلەیێکی ئاڵتون دەریسکانەوە، دەریهێنان و لە باغەری ناو ئینجا هەر بە غار بۆ لای دوکانی زێڕینگرەکانی ناو بازاڕ... لە دوکانێکی زێڕینگر لادەدات و بە فیەتیێک پێک دێن و پارەکە لە باغەری دەنێ و هەر بە غار ڕوو لە شەقامی شۆڕش دەکات، گوێ بەهەڵپاچینی سمێڵ و کورت کردنەوەی شەرواڵ و ڕیشە درێژەکەی نادات، هەر بەغار و بەبێ ماندووبون خۆی دەگەینێتە ڕیزە دوکانەکانی مەشروب فرۆشان... دەچێتە ژوورەوە لە کاتێکدا پڕ بە مستی پارەکەی ناو باغەری شەرواڵی گرتووە... داوای یانزە چارێک ویسکی بلاکجاکی سەرمۆر دەکات و بۆی دەخەنە عەلاگەیێکی ڕەش، لەم کاتەدا کابرای مەیفرۆش دەڵێ:

+ چییە کاکۆ دەرێی دەعوەتت هەیە؟

غەریب یەکسەر:

ـ بەرێ بەرێ،... دەعوەتی مەرگی غەریبێکم هەیە.

غەریب بە عەلاگە پڕ لە چارێکە ویسکییەکان و بە گیرفانی پڕ لە لوقمی سوور و بەم گەرمای هاوینە لە ڕۆخی شۆستەکە تاوێک لە سەرچیچکان دادەنیشێ و چاوەڕێی چۆڵبوونی دەورووبەر دەکات.. ئیدی وردە وردە سەر شۆستە و ئارەقکر و ئارەقفرۆش ون دەبن و نامێنن.. غەریبیش بە هێواشی بەسەر ئەو سەفتە بوزە لەسەر یەک کەڵەکەکراوە دەکەوێت کە لە ڕۆخی شەقامەکە بۆ فرۆشتن دانراوە... دەرەنگە شەوە و قالبە بوزەکان بە پارچە گوش داپۆشراون، غەریب سەرکەوت و چوو لەسەر سەهۆڵەکان، پشت لە شەقام و ڕوو لە دوکانی ئارەق فرۆشەکان

چوار چەمکی دانیشت، هەینیێ دەستی گێڕا و چارەگێکی ویسکی دەرهێنا و سەری بادا و هەڵیقوڕاند تا چۆڕەی لێ بڕی، بە گەززە و قەمپاڵان هەندێک لوقمە سووری کرماند، ئیدی چارێکی دووەم و قەمپاڵ لە لوقم... هێدی هێدی گەرم دادەهات و ژێرەوەشی سەهۆڵ و سارد و سڕ، جار جارە ناوڕی لە شەقام دەدایەوە و ترومبێلەکان تیژ تێدەپەڕین و هۆڕنیان بۆ لێدەدا و ئەویش دەستی بۆ ڕادەوەشاندن، ئیدی بەم شێوەیە غەریب چارێگ دوای چارێکی هەڵدەقوڕاند و هەلقومی دەملێچاند، ساتێک دونیا کشومات بوو، دوا چارێگی ویسکی لە یانزە چارێگەکە بەدەست غەریبەوە مابوو، ناوبەناو دەمی پێ تەڕدەکرد و چاوی لێڵ و پێڵ دەبوو، لەنێوان خەو و ئاگاییدا، لەنێوان هۆش و بێهۆشیدا چاوی ڕەشکە و پێشکەی دەکرد، تەواو بێتاقەت و هیلاک بوو، ئیدی وەک تەڕاح لینگی لێڕاکێشا و پالکەوت... وێنەی جۆراوجۆری ژیانی ڕابردووی دەهاتەوە بەرچاو، ڕووخساری بەگمی دایکی... تەبەشی پڕ لە ڕەونەقی گوڵخاتری عەشقەکەی تەیراوە... بزەو پێکەنینەکانی کامۆی حەمامچی براو برادەری... دووڕوویەکەی سەید عەبدولقادری حەساریێ... کەریم هەلهەلە... چوکلێتە فەندی... سیرۆ و جەبارە قەڵەوی تەیراوە و کۆڕی دانیشتن وعەرەق خواردنەوەیان، غەریب بەهۆش و بێهۆش یادی ڕۆژانی بەسەرچووی بەلێڵ و پێڵی دەهاتەوە بەرچاو... ئەوە سەبرییە دەستی منداڵەکانی گرتووە بەرەو لای ئەو بە غار باوەشیان کردۆتەوە... مەقام و گۆرانییە دڵنشینەکانی فەرهاد زیرەک، لە خۆدان و شین و گریانی خۆی..ئەو شەڕانەی کە یەخەیان دەگرت و ناچار بوو دەست بکاتەوە... باڕی سەنابل و زڕتە بۆزەکانی دایەرەی ئەمن و ژوورە تاریکەکانی زیندان.... غەریب تەواو پەرێشان بوو، تەواو

بێهۆش و بێئاگا، دواجار لە دوا هەناســـە لەدوا چاوکردنەوە و پشـــوو نوزەیێکی لێوەهات:

+ ئۆخەی کە ســـەربەرزم... ڕاســـتە لەو تەیراوەیەی بە ئارەقخۆر و قومارچی و بەڕەڵا ناســـرام، بەڵام ڕۆژەک لە ڕۆژان، جارێک لە جاران بەهیچ جۆرێک نامەردیم نەکرد... ئەمن هەموو شـــتێک بووم، هەموو شـــتێکم کرد، بەس دەگەی نامەردیم لەکەس نەوەشـــاند و قەتیش نامەرد نەبووم.

لەگەڵ هەڵکێشانی هەناسەیێکی قوڵ: ئۆخەی. ئیدی لەگەڵ کازیوەی بەیان، لەسەر پشت ڕاکێشاو بەتەواوی لینگی لێڕاکێشا، لاشەیێکی سارد و ســڕ و بێگیان و بێجووڵە لەســەر تەختە ســەهۆڵەکەی ڕۆح شــەقامی شۆڕش دوور لە تەیراوەکەی ڕەق بووەوە.

درەنگانێک کوڕانی گەڕەک بە مەرگی لەناکاوی غەریبەکەیان زانی، وەک هەموو جارەکان، یەک دەســـــت و یەک دڵ، جوامێرانە بەهانای غەریبە بێکەســەکەی تەیراوەکەیاندا هاتن و هەموو بوونە خزم و کەســی، پێکڕا چوون لاشە ڕەقهەڵگەڕاوەکەیان لەسەر سەهۆڵبەندانەکە هەڵگرت و هێنایانەوە تەیراوە و لە مزگەوتی کوێتی دایاننا، وردە وردە تەیراوەییە بەوەفاکان خڕبوونەوە، دەنگە دەنگ و تێک قژقژان و بەپەلە بوون.. هیچیان ناوی غەریبیان نەدەهێنا، دەیانگوت: ( زووبن جەنازەکە بشـۆن هەتا بۆنی نەکردییە، تخوا با کفنی مەیتەکە تێرو پڕ بیت زۆر بێکەس و قەلەندەرە، ڕەحمەتی خواتان لێبیت با زۆرترین کەس نوێژ لەســەر مردییەکە بکات و هەمووتـان گەردەنی ڕەحمەتی ئـازاد بکەن، خێرتـان دەگـاتێ، دەبزانن قەبر حازرە با چیدی ئەو لاشـــەیە لەو گۆڕەی نەمینێتەوە، یا ڕەبی گەردنی خۆش و ئازابی کوڕەکی زۆر بیدەخل بوو... ئیدی شـــۆردیان و کفنیان

کرد بە لائیلاهە ئیلاڵڵا لەناو دارەبازەیان دانا و خستیانە سەرشانان و گەیاندیانە گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشید، لەنێوان دایە بەگم و سەبری شاردیانەوە و خۆڵیان بەسەر داکرد و پەستیانەوە و دوو بلۆکیان بۆ کردە کێل و مەلا تەڵقینی دا و فاتیحا خوێندراو بە تاقی تەنیا بەجێهێڵدرا.

غەریبێک ئەو هەموو سەراو و دەراوەی لە ژیانیدا چەشت، ناوی لەناو ناواندا نەما و بووە ( لاشە و جەنازە و مەیت و ڕەحمەتی و مرد و تەرم).

هەنووکە غەریب مراوییەکی سپی سپییە، بە دوو باڵی سپییەوە لە ئاسمانی تەیراوە بەسەر حەساری محەمەد موختاریدا دەسووڕێتەوە.

غەریب ... وێنەی جۆراو جۆری ژیانی بەسەرچووی دەهاتەوە بەر چاو : سەبرییە دەستی منداڵەکانی گرتووەو بەغار دێتەوە لای ، مەقام و بەستەو گۆرانیەکانی فەرهاد زیرەک ، حەسارنشینەکانیان ( کەریم هەلهەلە و چوکلێتە فەندی و سەید عەبدولقادری دوو ڕوو ) ، تەبەشی پڕ لە ڕەونەقی گوڵخاترە کۆترۆکەکەی تەیراوە ، سیرۆ و جەبارە قەڵەو و کۆڕ و گەعدەی ئارەق خواردنەوەیان ، ئەو شەڕانەی کە یەخەیان دەگرت و ناچار بوو دەست بکاتەوە ، باڕی سەنابل و زڕتە بۆزەکانی دایەرەی ئەمن . غەریب تەواو پەرێشان و بێهۆش و بێئاگا بوو ، دواجار لە دوا هەناسە و دوا لرخە نوزەیێکی لێوەهات :

-- ئۆخەی کە سەربەرزم .. ڕاستە لەو تەیراوەیەی بە عارەقخۆر و قومارچی و سەرسەری و بەڕەلا ناسرام ... بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان نامەردیم نەکرد ، ئەمن هەموو شتێک بووم ، هەموو شتێکم کرد .. بەس دەگەی نامەردیم لەکەس نەوەشاندو قەتیش نامەرد نەبووم .



